55
پرۆژەی تیشک



# دەروازەیەک لەسەر کێشەی ڕۆچوون لەئایندا

## هۆکار.. کاریگەریتی.. چارەسەر..

یاسین ئەحمەد زەنگەنە

پرۆژەی تیشك (55)



# دەروازەیەك لە مەڕ کێشەی ڕۆچوون لە ئاییندا

## هۆکار .. کاریگەرێتیی.. چارەسەر

ئامادەکردنی:

یاسین ئەحمەد زەنگەنە

2009-1430

پرۆژەی تیشك

ناوی كتێب: دەروازەیەك لە مەڕ كێشەی ڕۆچوون لە ئاییندا
هۆكار.. كاریگەرێتی .. چارەسەر
ئامادەكردنی: یاسین ئەحمەد زەنگەنە
ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٣١٣) ساڵی (٢٠٠٩)
نۆرەی چاپ: یەكەم
ساڵی چاپ: ٢٠٠٩
نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد
لە بڵاوكراوەكانی: پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٥٥)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:
www.tishkbooks.com
ئیمەیلی پرۆژە:
info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكیی:[1]

ڕۆچوون لە ئاییندا دیاردەیەكی كۆنەو تەمەنی بەقەد تەمەنی مرۆڤایەتی دەبێت، مرۆڤایەتیی بە درێژایی مێژووی خۆی، لە هەر قۆناغێكدا بە شێوازێك بەم كێشەو قەیرانەوە تلاوەتەوە، هۆكاری سەرهەڵدان و گەشەكردنی لەسەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی تر دەگۆڕێت، بەڵێ ڕۆچوون بابەتێكی تازە نییەو نامۆ نییە بە مرۆڤایەتیی و لە شوێنكەوتەی هەموو ئایین و ڕێبازێكدا بە ڕێژەی جیاواز حوزووری هەبووە، هەر لەسەرەتای ئایینی پیرۆزی ئیسلامیشەوە ئەم نەخۆشییە ترسناكە سەری هەڵداوەو زیانێكی گەورەی بە قەوارەی ئیسلامیی و كۆمەڵگای ئیسلامیی گەیاندووە، ناحەزانی ئیسلامیش زۆر جار ئەم بابەتەیان قۆستۆتەوەو فویان پێداكردووە، لەم میانەیەوە تۆمەت و پلاریان ئاڕاستەی پەیامی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمانان گرتووە. ڕاستییەكی حاشا هەڵنەگرە كە ڕۆچوون و زێدەڕۆیی لە مرۆڤدا بۆتە دیاردەیەكی جیهانیی و مەبەستی جیاجیای لە پشتەوەیە. لەبەر گرنگیی و هەستیاریی بابەتەكە زانایان و ڕووناكبیران و بیرمەندان و سیاسەتمەداران پێوەی سەرقاڵ بوونەو لێكۆڵینەوەی وردی لەسەر ئەنجام دەدەن، هۆكاری سەرهەڵدان و كاریگەرێتی و دەرەنجامەكانی تاوتۆی دەكەن، هەریەكەو بەپێی بۆچوون و جیهانبینیی خۆی باس لە چارەسەركردنی دەكات، تا زیان و كاریگەرێتییەكانی لەسەر تاك و كۆمەڵگاو مرۆڤایەتیی تا ئەوپەڕی توانا نەهێڵرێت یان سنووردار بكرێت. ئەم دیاردەیەش لە نێو كۆمەڵگای ئیسلامییدا وەك كێشەیەك بوونی هەیەو پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

---

[1] ئەم بابەتە لە كانونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ دا نووسراوە، بەڵام لە تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ پێدا چوونەوەی بۆ كراوە.

(لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا شبرا وذراعا بذراع حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم).[٢]

ئەم دیاردەیەش لەم سەردەم و قۆناغەدا پاساوی بوون و مانەوەی هەیە وەك كێشەو قەیرانێك و زیانی گەورەی بە كۆمەڵگای ئیسلامیی گەیاندووە. شتێكی سەیرو نامۆ نییە كە ناحەزانی ئیسلام ئەم بابەتەیان قۆستۆتەوەو لەم میانەیەوە دژایەتی ڕەوت و كاری ئیسلامیی دەكەن بە گشتیی و تۆمەتی توندڕەویی و توندوتیژیی دەدەنە پاڵ ڕەوتە ئیسلامییە میانڕەوەكانیش و ڕای گشتیی نێوخۆو دەرەوە چەواشە دەكەن. ئەمەو ئیسلام وەك پەیام و بەرنامەیەكی میانڕەوو گشتگیرو سانا، دەرگاو دەروازەی بەڕووی ڕۆچوون و زێدەڕۆییدا گرتووە، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین شێوازی جۆراوجۆری پەیڕەوكردووە تا ژیانی موسڵمانان خاوێن كاتەوەو بیپارێزێت لە زیان و مەترسییەكانی ئەم دیاردە نامۆ بە ئیسلامە، ئەوی ماوەتەوە لەم پێشەكییەدا بیڵێم ئەوەیە، لەبەر هەستیاری بابەتەكەو جۆرێك لە كاریگەرێتی لەسەر كۆمەڵگای كوردەواری و ڕەوتی ئیسلامخوازی كوردستان، هەستاین بە ئامادەكردنی ئەم بابەتە لە چوار بەشدا، تا خوێنەری كورد و لایەنی پەیوەندیدار بەرچاو ڕوون بێت و بزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم جۆرە كێشانەدا بكات، بە پێوەرو تەرازووی قورئان و سوننەت لە مەسەلەكان بڕوانێت و شەنوكەوی بكات، خوازیارم توانیبێتم كەلێنێكم لەم بوارەدا گرتبێ، هەرچەندم پێكابێت ئەوا بەخششی خودایە و گەرنا ئەوا هەڵەی خۆمەو دەخوازم پیاوانی ئەم مەیدانە لێی بێدەنگ نەبن و بۆ من و بۆ خوێنەرانی بەرێزیشی ڕاست بكەنەوە.

یاسین ئەحمەد زەنگەنە

كانوونی دووەم / ٢٠٠٦

---

[٢] رواه البخاري ٤/٣٤٥٦ وە ٢/٧٣٢٠ بڕوانە صحيح البخاري لاپەڕە ٨٨٧ و١٧٧١ مسلم ٦٧٢٣ بڕوانە صحيح مسلم لاپەڕە ١٢١٢

## بەشی یەکەم: دەسپێکێك سەبارەت بە ڕۆچوون

### باسی یەکەم: چەمك و مانای ڕۆچوون:

زانایانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا چەمکی ڕۆچوونیان بە شێوازی جیاجیا پێناسە کردووەو مەبەست و ماناکەیان ڕوون کردۆتەوە، بەڵام پێناسەکان لە نێومرۆکدا لێك نزیکن، ئیبن حەجەری عەسقەلانیی لە پێناسەی ڕۆچووندا (الغلو) دەڵێت: (المبالغة فی الشیٔ والتشدید فیه بتجاوز الحد).[٣]

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی (الغلو مجاوزة الحد بأن یزداد فی الشیٔ فی حمده أو ذمه علی ما یستحق و نحو ذلك).[٤]

بە واتایەکی دی، ڕۆچوون (الغلو) بریتییە لە (الافراط في مجاوزة المقدار المعتبر شرعا في امر من امور الدین)[٥]

دەبینین ڕۆچوون خۆی لە بەزاندنی سنووری شەریعەت و لادان لە ڕاستە شەقامی پەیامی ئیسلامدا دەبینێتەوە، ئەو سەرکەشی و یاخیی بوونەیە کە خوداوەند قەدەغەی کردووە لەسەرمان و فەرمویەتی (ولا تطغوا فیه فیحل علیکم غضبی).طه:٨١.

زیادەڕەویی و گوناهکاریی و فێڵ و تەڵەکە مەکەن بۆ ئەوەی خەشم و قینی من داتان نەگرێتەوە.(تەفسیری ئاسان، مامۆستا بورهان محمد أمین).

ئیمامی ئیبن قەییمی جەوزی ڕەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی (ما أمر الله بأمر إلا و للشیطان فیه نزعتان: إما الی تفریط وإضاعة، وإما الی إفراط وغلو، و دین الله وسط بین الجافی عنه و الغالی فیه، کالوادی بین الجبلین و الهدی بین ضلالتین

---

[٣] بڕوانە مشكلة الغلو في الدین لاپەڕە ٢٩

[٤] بڕوانە الغلو في الدین لاپەڕە ٨١

[٥] بڕوانە الجذور التاریخیة لحیقتة الغلو والتطرف والارهاب و العنف لاپەڕە ٧

والوسط بين طرفين ذميمين، فكما أن الجافى عن الأمر مضيع له فالغالى فيه مضيع له، هذا بتقصيره عن الحد، وهذا بتجاوزه عن الحد).[6]

شەیتان وەك دوژمنێكی سەرسەختی مرۆڤایەتیی بەرامبەر بە هەر فەرمان و بڕیارێكی خوای گەورە دوو جۆر ئاراستەو هەواداری هەیە، یان بەزایە دان و فەوتانی فەرمانی خوای گەورە یان زێدەڕیی و ڕۆچوون لە جێبەجێكردنی فەرمانەكەدا، بەلاَم ئایینی خوا میانەیە لە نێوان بەزایەدان و زێدەڕۆییدا، وەك دۆڵێك وایە لە نێو دوو چیادا وەك تاكە ڕێنوێنییەك لە نێوان دوو گومڕاییدا، میانەیە لە نێوان هەردوو لا خراپ و بێزراوەكەدا، هەروەك چۆن بەزایەدان فەوتانی فەرمانی خوایە هەروەها زێدەرۆیش تێیدا فەوتان و لە دەستدانی فەرمانی خوای گەورەیە، یەكەمیان بەكەمتەرخەمی لە جێبەجێ كردنی فەرمانەكەو ئەوی تریان بە رۆچوون لە جێبەجێ كردنیدا.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كەحەق میانگیرە لە نێوان زێدەڕۆیی بە زایەدان، هەر بۆیە ئیمامی شەنقیتی ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمویەتی (من جانب التفريط والافراط فقد اهتدى).[7]

## باسی دووەم: ڕەگ و ڕیشەی ڕۆچوونی هاوچەرخ

بێگومان هەموو دیاردەیەك گەر بە وردی تەماشای بكەین و لێكۆڵینەوەی زانستیی لەسەر ئەنجام بدەین دەبینین بە جۆرێك لە جۆرەكان ڕەگو ڕیشاڵی هەیەو پەیوەندیی بەڕابردوی دوورو نزیكی خۆیەوە هەیە، لێرەدا دیاردەی ڕۆچوونی هاوچەرخ لە سێ ڕیشاڵدا دەخەینە ڕوو:

[6] بڕوانە الغلو فی الدین لاپەڕە ٣٠

[7] بڕوانە مشكلة الغلو في الدين لاپەڕە٣٠

یەکەم: ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی

گەر بە وردی بڕوانینە ڕێچکەی شووراتەکان – الخوارج [٨]– بۆ نموونـە، دەبیـنین خاڵی لێکچوونیان هەیە لەگەڵ ڕۆچوونەکانی ئەم سەردەمە وەك:

أ– بە کافردانانی ئەو کەسانەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن.

ب – دابڕان و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگا.

ج – بە کافردانانی ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان نەکردووە.

د – وڵاتانی ئیسلامیی خانەی کوفرەو خوێنڕشتنیان دروستە.[٩]

ئەمەو دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین ئـەم خـاڵی لێکچوونانە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە ڕۆچووەکانی ئەم سەردەمە ئەم دیاردەیان لەوانەی پێشووەوە وەرگرتووە. بەپێی لێکۆڵینەوەی وردو زانستیانە ڕوون بۆتـەوە، ڕۆچـووەکانی ئـەم سـەردەمە هـیچ پەیوەندییان بەوانەی پێشووەوە نییە، بەڵگەش زۆرە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە لەوانە:

١ – ئەو هەلومەرجەی ئەم بۆچوون و ڕایانەی تێدا هاتۆتە دی، وا ئاسان نەبووە بۆیان بگەڕێنەوە بۆ کتێب و نووسراوەکانی پێشوو، ڕۆچونی هاوچەرخ لە گۆشەی بەندیخانە تاریکەکان و دەرەنجامی ئەشکەنجە و ئازاری نێو زیندانـەکان هاتۆتـە ئاراوە، بە ئەندازەیەکی زۆر لە زیندانەکانی میسر، لە نێو زیندانەکاندا هیچ کتێب و سەرچـاوەو ئـامرازێکی تـر نـەبوە تـا سـودی لێ وەربگیرێـت. تەنانـەت زۆر جـار قورئـانیش لەبەردەسـتدا نـەبوە. تاکـە سەرچـاوەیان ئـەو دەقانـەی قورئـان و

---

[٨] پێیان وتراوە (الخوارج) دەرچوەکان، چونکە دەرچوونە لە فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالب خولی لێ ڕازی بێت. ئەمەو زاراوەی خەواریج وەك بەکارهێنانێکی شەرعیی هەموو دەرچوونێك دەگرێتەوە لە پێشەوایەکی هەق (الامام الحق) کە کۆمەڵی موسڵمانان لەسەری کۆك بن لە هەر سەردەمێك لە سەردەمەکاندا. بڕوانە (الغلو فی الدین) لاپەڕە ٧١ و ٨٩.

[٩] بڕوانە مشکلة الغلو في الدین لاپەڕە ٣٩ و٤٠

فەرمووده بووه كـه لـه بـەریان بـووه، لەگـەڵ زانیـاریی گشتیی خۆیانـدا. بۆیـه دەبیـنین هەلومــەرجی نائاسـایی نێـو بەندیخانــەو زوڵــم و سـتەمی ڕژێمــەكان، كاردانەوەی هەڵەو ڕۆچوون و زێدەڕەوی بە شوێندا دێت.

٢ – گەر هەموویان نەڵێین ئەوا زۆربەی ئەو كەسانەی تووشی ڕۆچوون وزێدەڕۆیی بون زاناو پسپۆڕو شارەزا نەبوونە بە زانستە شـەرعییەكان، شـارەزاییان نـەبووه سەبارەت بە سەرچاوەو نووسراوەكانی پێشووی ڕۆچووەكان.

٣ – ڕۆچوون لە ئەنجامی گفتوگۆو لێكدانەوه سـەبارەت بـە هەنـدێ مەسـەلەی هەنووكەیی هاتۆتە ئاراوه، واتە ڕۆچوون لە دایكبووی هەلومەرج و بارودۆخێكە، هیچ ڕێبازو بنەمایەك نەبووه، تا لەسەری ڕێككەون.

٤ – هەنـدێك لەوانـەی كـه كەوتبوونـه نێـو بازنــەی ڕۆچـوونەوه، كاتێـك بۆیـان دەركەوت سەرەتای ئەم دیدوبۆچوونانە لە شـووراتەكانەوه – خـوارج – سـەری هەڵداوه، پاشگەزبوونەوە لە ڕاوبۆچوونەكانیان، چونكە پێشتر وایـان زانیـوه كـه خۆیان دەستپێشخەری ئەم كارەن.. بەڵام دواتر ڕۆچووه هاوچەرخەكان سودیان لە دیدو بۆچوون و بەڵگەو پاساوی نێو كتێـب و نووسـراوە كۆنـەكان وەرگـرت، چونكە ئەو كەسانەی گفتوگۆیان لەگەڵ دەكردن بۆیان ڕوون دەكردنەوە كە دیدو بۆچوونەكانیان هاوشێوەی – خوارج – و دەستە گومڕاكانی ترە، لە ڕوانگەی ئەو دیـالۆگ و وتـارو بابەتانــەی لەسـەریان بڵاودەكرایـەوە، ئـەمانیش هەسـتان بـە خوێندنەوەو تاووتوێ كردنی نووسراوو كتێبەكانی پێشوو، بۆ بەهێزكردنی پاساوو بەڵگەو گوتاری سیاسیان.

لە كۆتاییدا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی كەوا كاریگەرێتی ڕۆچووه كۆنەكان لەسەر نوێیــەكان كاریگەرێتییــەكی دواتـر بـووه، نەبۆتــە هــۆی دروسـتبوون و هاتنــە

مەیدانیانەوە، بەڵام بۆتە مایەی بەهێزبوون و فراوان بوونی ڕەوتەکەیان و بەلگەو پاساوەکانیان.

دووەم: ڕەگ و ڕیشەی دەرونیی یان فیکریی و زانستیی

أ – ناتەواویی و ناهاوسەنگیی باری دەرونی ڕۆڵی خۆی هەیە و ناکرێت بە گشتیی نکوڵی لێ بکرێت، بەڵام ناتەواویی باری دەروونیی مەسەلەیەکی خودییە، گەر کەسێکی توندو ڕۆچوو باری دەروونیی نائاسایی بوو، ناکرێت ئەمە بکرێتە ڕێساو بنەما و بەسەر هەموو ڕۆچووەکاندا بچەسپێت، یان بوترێت ڕۆچوون بە گشتیی لە دەرەنجامی ئەم ناهاوسەنگیی و ناتەواوی باری دەرونییەوە دروست دەبێت.

ب – زۆر لە خەوش و ناتەواویە دەرونیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فشارانەی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە، مرۆڤ بە دەروون ناتەواوی لە دایك نابێ، بەڵکو باری دەروونی بەپێی پەروەردەو بارودۆخ دروست دەبێت و گۆڕانی بەسەردا دێت.

ج – لای هەندێ لە ڕۆچووەکان ئامادەیی دەروونیی هەیەو فشارەکان بە ئاسانی کاریان لێ دەکات و کاردانەوە دروست دەبێت و ڕۆچوون و زێدەڕۆیی دروست دەبێت، بە تایبەتی لای لاوان. هەربۆیە پسپۆڕانی بواری دەروونناسیی دەڵێن: گەر مرۆڤ لە بارودۆخ و واقیعێکدا خۆی بینییەوەو پێی قبوڵ نەکرا، ئەوکات لە نەستیدا دەکەوێتە کاردانەوە، هەرکات کارەکان بەهێزبوون، ئەوا کاردانەوەکەش بەهێز دەبێت، پێدەچێت بەرەو توندڕەویی و توندوتیژیی هەنگاو بنێت.[١٠]

ئەمەو لاوان لە زۆربەی توێژەکانی تری نێو کۆمەڵ زیاتر دەکەونە نێو داوی ڕۆچوون و سەرکەشییەوە، چونکە ئەم توێژە کۆمەڵایەتییە وزەو تواناو حەماسەتیان زۆرە، بەڵام کەمئەزمونن و ئاستی زانستییان لاوازە.

---

[١٠] بڕوانە الغلو فی الدین لاپەڕە ١١٦

د – ڕۆچون كاردانەوەیە، یان دەرهاویشتەیەكی سروشتیی زنجیرە كێشەیەكی سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیی نێو كۆمەڵگایە، ڕۆچووەكان دەكەونە ژێر فشاری توندەوەو هاوسەنگیی لە دەست دەدەن.

كێشەكە دوو جەمسەری هەیە:

یەكەم: بوونی قەیران و كێشەو بزواندنی و وروژاندنی ئەندامانی كۆمەڵگایەكی دیاری كراو (كار).

دووەم: ناڕازییبوون بەم دیاردەو قەیرانە (كاردانەوە).

كاردانەوەش گەر بە شێوازی توندو ڕۆچووانە بێت ئەمەش دوو هۆی هەیە:

أ – تێكچوونی پرۆگرام و ڕێبازی زانستیی.

ب – تێكچوونی پرۆگرام و ڕێبازی كرداریی.

## باسی سێهەم: دەروازەیەكی مێژوویی لەسەر چەمكی ڕۆچوون لە ئاییندا:

یەكێك لەو راستییە روون و ئاشكرایانەی كە دەقەكانی قورئان و فەرمووده بۆمان دەگێڕنەوە و باس لە هەڵوێست و ئاكاری گەلانی پێش ئیسلاممان بۆ دەكەن، ئەوانەی شوێنكەوتەی پەیام و بانگەوازی پێغەمبەران بوون (سلاوی خوایان لێ بێت) بە ڕێژەی جیاواز پابەندبوونە بە بەرنامەو پەیامی خوداوە، دەكرێت بەسەر سێ كۆمەڵەدا دابەشیان بكەین:

یەكەم: گەردنگیر بە حەق و ڕاستیی و بەردەوام بوون لەسەری.

دووەم: شلڕەوو چەوت و لارو بەزاندنی سنوورە شەرعییەكان.

سێهەم: ڕۆچوون و زێدەڕۆیی لە سنوورەكانی خوای گەورە.

ئەم سێ تاقمە لە ئایینەكانی پێش ئیسلامدا بوونی هەبووەو لە كۆمەڵگای ئیسلامییشدا هاتۆتە ئاراوە، بەنی ئیسرائیل ڕۆچوون لە ئایینەكەیان و

سەركەشييان كردو خواى گەورەش ئاگادارى كردنەوە و نەهى لێكردن (يا أهل الكتاب لاتغلوا فى دينكم ولا تقولوا على الله الا الحق، إنما المسيح عيسى ابن مريم رسول الله وكلمته القاها الى مريم، وروح منه فأمنوا بالله ورسوله ولا تقولوا ثلاثة انتهوا خيرا لكم إنما الله إله واحد سبحانه أن يكون له ولد له ما في السماوات وما في ألأرض و كفى بالله وكيلا) النساء ١٧١.

ئەى خاوەنانى كتێب، زيادەڕەويى مەكەن لە ئايينەكەتاندا، جگە لە حەق و ڕاستيى هيچى تر بەدەم خواوە مەڵێن، بە ڕاستيى مەسيح عيساى كوڕى مەريەم جگە لەوەى كە فروستادەى خوايە شتێكى تر نەبووە، لە دايكبوونەكەى بە فەرمانى خوا بووە، كە لە مەريەمدا (بەرجەستە بوو)، عيسا ڕۆح و گيانێكى (تايبەتييە) لەلايەن خواوە بەخشراوە، دە ئيتر باوەڕى دامەزراو بە خوايەتى خواو بە پێغەمبەرانى بهێنن، هەرگيز مەڵێن: خوا سيانە (لەو گوفتارە نابەجێيە) واز بهێنن چاكترە و قازانجتانە، بەڕاستيى خوا تەنها يەك تاكە خوايە، پاك و بێگەردو دوورە لەوەى كە منداڵى ببێت (بوختانى ناقۆڵاى وا چۆن دەكەن) ؟ ! هەرچى لە ئاسمانەكان و هەرچى لە زەوييدا هەيە هەر هەمووى ئەو خاوەنيانە، بێگومان خوا بەسە كە بەديهێنەرو سەرپەرشتيارى (دروستكراوانى بێت) (تەفسيرى ئاسان).

هەروەها فەرموويەتى: (قل يا أهل الكتاب لاتغلوا فى دينكم غير الحق و لاتتبعوا أهواء قوم قد ضلوا من قبل وأضلوا كثيرا وضلوا عن سواء السبيل) المائدة٧٧.

هەروەها بڵێ ئەى خاوەنانى كتێب زيادەڕەويى مەكەن، لە ئايينەكەتاندا بە زيادەڕەويى نابەجێ و لە سنوورى حەق و ڕاستيى دەرمەچن، شوێنى ئارەزووى ئەو كەسانە مەكەون، كە بێگومان پێشان گومڕابون و زۆر كەسيشيان گومڕا كردو ئەوانيش لەو ڕێگەو ڕێبازە لاياندا. (تەفسيرى ئاسان)

ئەمەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (... إياكم والغلو في الدين، فأنما أهلك من كان قبلكم الغلو في الدين).[11] هەروەها فەرموویەتی (هلك المتنطعون، قالها ثلاثا)[12]

هەروەها فەرموویەتی: (ان هذا الدين يسر ولن يشاد الدين أحد الا غلبه).[13]

دەقە شەرعییەكانی قورئان و فەرموودە هەرچەندە باسی خاوەن پەرتووكەكان دەكەن، بەڵام مەبەست ئاگاداركردنەوەی موسڵمانانە كە هوشیار بن و دووركەونەوە لە ڕۆچوون و زێدەڕەویی و یاخییبوون لە سنوورەكانی خودای گەورە، كە مایەی فەوتان و گومڕاییە.

**باسی چوارەم: دیاردەی ڕۆچوون لەم چاخ و سەردەمەدا:**

ڕۆچوون لەم سەردەم و قۆناغەدا خۆی لە چەندین شێوازی جۆراوجۆردا دەبینێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:

١ – ڕۆچوون لە چەمك و مانای زاراوەی كۆمەڵ.

لێرەدا ئەو فەرموودانەی كە باس لە پەیوەستبوون و پابەندبوون بە كۆمەڵەوە دەكەن (عليكم بالجماعة) ئاوەژووی دەكەنەوەو وای پێناسە دەكەن و لێكی دەدەنەوە كە مەبەست لە كۆمەڵ، ئەو كۆمەڵ و لایەنەی خۆیانەو بەس.

٢ – ڕۆچوون و دەمارگیریی بۆ كۆمەڵێك یان لایەنێكی دیاری كراو، یان ئەو كۆمەڵ و لایەنە بە سەرچاوەو پێوەری حەق دەزانرێت.

٣ – بە كافردانانی خەڵكی بەهۆی تاوانەوە.

---

[11] رواه النسائی ٣٠٥٤ بڕوانە سنن النسائی لاپەڕە ٧٢٧و رواه الامام احمد فی مسندە وابن ماجه

[12] رواه مسلم ٦٧٢٥ بڕوانە صحيح مسلم كتاب العلم باب هلك المتنطعون لاپەڕە ١٢١٢

[13] رواه البخاري، بڕوانە صحيح البخاري ١/٣٩ لاپەڕە ٨٠.

٤ – بە كافردانانی ئەو كەسانەی لە بازنەی كۆمەڵەكەیان دەچنە دەرەوە.

٥ – بە كافردانانی ئەو فەرمانڕەوایانەی حوكم بە قورئان و فەرموودە ناكەن، بە شێوەیەكی ڕەهاو بێ گوێدانە هەلومەرج و پێوەرە شەرعییەكان.

٦ – بە كافردانانی خەڵكیی كە بە حوكمی خوا كارناكەن، بە شێوەیەكی ڕەهاو بێ ڕەچاوكردنی دەقەكانی شەریعەت.

٧ – بە كافردانانی ئەو كەسانەی كۆچیان نەكردووەو وڵات و كۆمەڵگاكەیان بەجێ نەهێڵاوە.

٨ – بە كافردانانی خەڵكیی و دواتر بە كافردانانی ئەو كەسانەی ئەو خەڵكە بە كافر دانانێن.

٩ – ڕۆچوون سەبارەت بە سەركردەو فەرماندەی كۆمەڵ و لایەنەكان. جا ئەم ڕۆچوونە لە قاڵبی ستایش و شانازییدا بێت یان تانەو تەشەر و پلاردا بێت.

١٠ – حوكمدان بەوەی وڵاتە ئیسلامییەكان – دارالكفر– ن، خانەی كوفرەو لە میانەی ئەمەوە خوێن وماڵی خەڵكییان حەڵاڵ دەكرد.

١١ – ڕۆچوون لە چەمكی لاسایی كردنەوە بە شێوەیەكی ڕەها، نكوڵی كردن لە كۆ دەنگی زانایان.

١٢ – ڕۆچوون لە زەمی ئەو كەسانەی لاسایی دەكەنەوە.

١٣ – پابەند كردنی خەڵكیی بە گشتیی بۆ ئەوەی ئیجتیهاد بكەن و بگەنە حوكمە شەرعییەكان.

١٤ – بە حەرام زانینی ئەو شتانەی پاك و حەڵاڵ و بێ لەكەن.

١٥ – توند كردن و گران كردنی دین لەسەر خەڵكیی.

١٦ – هەستان و دژایەتییكردنی فەرمانڕەوای موسڵمان.

١٧ – هەستان و دژایەتییكردنی فەرمانڕەوای ستەمكار.

١٨ – نوێژنەكردن لە مزگەوتەكاندا، گوایە لەسەر بنەمای تەقواو خواپەرستی دانەمەزراون، جگە لەو چوار مزگەوتە – مسجد الحرام – مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) مسجد الاقصى – مزگەوتی قباء–.

١٩ – نەكردنی نوێژی هەینیی بە بیانووی ئەوەی موسڵمانان لە قۆناغی لاوازییدان.

٢٠ – ڕۆچوون لە دابڕان و دووركەوتنەوە لە كۆمەڵگا بە تەواوی.

٢١ – قسەكردن سەبارەت بە قۆناغبەندیی حوكمە شەرعییەكان، وەك ئەوەی ئێستا قۆناغی – مكية – و ئێمەش وەك ئەو قۆناغە ئیسلام جێبەجێ دەكەین.

٢٢– نەكردنی كارو فرمان لە دەزگاو ناوەندە حكومییەكاندا.

٢٣ – دەمارگیری بۆ رای تایبەتی خۆیان و داننەنان بە رای بەرامبەر لەو بوارو كارانەی كە لە بازنەی ئیجتیهاد و ئەگەرەكاندان.

٢٤ – پابەند كردنی خەڵكی بەو شتانەی كە خوای گەورە داوای نەكردوە لە بەندەكانی پێوەی پابەند بن.[١٤]

دوای ئاماژەدانێكی خێرا بەچەند شێوازێكی رۆچوون لێرەدا بە پێویستی دەزانین چەند تێبینییەك بخەینە روو:

١– گروپ و دەستە رۆچووەكان، هەریەكەو خاڵێك یان چەند خاڵێك لەوانە دەیانگرێتەوە، بەپێی بازنەی رۆچوونەكانیان.

٢– رۆچوون خۆی لە خۆیدا بزاڤێكە بە ئاراستەی بنەما شەرعییەكان و فەرمانەكانی خوای گەورە، بەڵام ئەم بزافە مەوداو سنوورەكان دەبەزێنێت كە خوای گەورە دەستنیشانی كردووە. رۆچوون لە هەندێك حاڵەتدا جۆرە

[١٤] بڕوانە مشكله الغلو فى الدين لاپەڕە ٨٤ و ٨٥.

زێدەڕۆییەكە لە پابەند بوون بە دینەوە بەو ئەندازەیەی كە خوای گەورە داوای نەكردووە لە بەندەكانی، نەك دەرچون لە بازنەی دین بە تەواوی.

٢– رۆچوون هەموو جار ئەنجام دانی كارێك نییە، بەڵكو هەندێك جار وازهێنانە لە كارێكی دیاریكراو، وازهێنان لە حەڵاڵ و حەرام، كردنی شێوەیەكە لە شێوەكانی رۆچوون گەر بەمەستی دینداریی و پابەندبوون بە دینەوە بێت.

٣– دانە پاڵی زاراوەی رۆچوون بۆ سەر ئایین وەك دەستەواژەی رۆچوون لە ئاییندا دەشێت، لێرەدا رۆچوون لە خودی دینەكەدا نییە، بەڵكو لە شێوازی دینداریەكەدایە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی (لا تغلوا فى دينكم) المائده ٧٧ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (اياكم والغلو فى الدين). [١٥]

## باسی پێنجەم: ڕوخسارەكانی ڕۆچوون لە ئاییندا

لێرەدا ئاماژە بە چەند سیماو ڕوخسارێكی ڕۆچوون دەدەین لەوانە:

یەكەم: ڕۆچون پەیوەستە بە فیقهی دەقەكانەوە.

ئەمەش بەیەكێك لەم كارانە دێتە دی:

أ – شیكردنەوەو ڕاڤەكردنی دەقەكان بە شەقلێكی توندڕەوانە، كە پێچەوانەیە بە سیمای گشتیی شەریعەت و مەبەستە بنەڕەتییەكانی، ئەو كات توندیی لەسەرخۆی و خەڵكیی پەیڕەو دەكات.

ب – بە سەرخۆداسەپاندنی جۆرە ڕاڤەكردنێكی قورئان، كە خوداوەند داوای ئەوەی لە موسڵمانان نەكردووە. ئیمامی شاطبی فەرمویەتی (ومن طماح النفوس الى مالم تكلف به، نشأت الفرق كلها أو أكثرها). [١٦]

---

[١٥] رواه النسائى ٣٠٥٤ بڕوانە سنن النسائى لاپەڕە٧٢٧ و رواه الامام احمد فى مسنده وابن ماجه

[١٦] بڕوانە الغلو في الدين لاپەڕە ٨٣

دووەم: یان ڕۆچوون پەیوەستە بە ئەحكامەوە: ئەمەش لە دوو خاڵدا ڕەنگ دەداتەوە

أ – خۆ پەیوەست كردن و بەسەرخۆداسەپاندنی چەندین سروتی ئایینیی و نزاو عیبادەتێك كە خوای گەورە فەرمانی پێ نەكردووە.

ب – قەدەغەكردنی شتی چاك و پاك و بەچێژ، كە خوای گەورە ڕێپێیداوەو دروست و ڕەوایە. ئەمەش جۆرە ڕۆچوون و زێدەڕەوییەكە.

ج – وازهێنان لە پێویستییەكان یان لە هەندێكیان، وەك وازهێنان لە خواردن و خواردنەوەو هاوسەرگیریی و خەوتن و شتی تر، وازهێنان لەمانە ڕۆچوون و زێدەڕەوییەو پێچەوانەی ڕەوت و سوننەتی ئەم ئایینەیە.

سێیەم: یان ڕۆچون پەیوەستە بە هەڵوێست وەرگرتن لە كەسانی تر ئەمەش لە دوو شێوەدا خۆی دەبینێتەوە:

أ – هەڵوێست وەرگرتن لە كەسانێك یان كۆمەڵێك، بێئەندازە ستایشیان دەكەن و بەسەرچاوەی حەق و ڕاستییان لە قەڵەم دەدەن و پلەی بێ هەڵەو بێپەڵەییان دەدەنێ.

ب – هەڵوێستوەرگرتن لە كەسانێك یان كۆمەڵێك، بێئەندازە سەرزەنشتیان دەكەن و تا ئاستی بە كافرداناییان، یان مۆركی كۆمەڵگای ئیسلامیی دادەڕنرێت لەو كۆمەڵەو بە كۆمەڵگای نەفامی ناوزەد دەكرێت.

## باسی شەشەم: جۆرەكانی ڕۆچوون لە ئاییندا

یەكەم، ڕۆچوونی تێكڕایی لە ئایین و بیرباوەڕدا.

ئەم جۆرەیان بواری عەقیدەو بیروباوەڕ دەگرێتەوە وەك ڕۆچوون لە بە كافرزانین دا، وەك بە كافردانانی كەسانی گوناهبار، ئەم جۆرە ڕۆچوونە مەترسیدارترین

جۆری ڕۆچوون و زێدەڕەو دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین هۆكاری دروستبوون و هاتنە كایەوەی دەستەو تاقمە گومڕاكان ڕۆچوونی تێكڕایی بوو لە بیروباوەڕدا.

دەشێت بڵێین: سیفات و خاڵی لێكچوونی دەستەو گرووپە ڕۆچووەكان بە درێژایی مێژوو لێك نزیكن. لە فەرمودەیەكدا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمویەتی: (ان من ضئضئ هذا قوما يقرؤن القرأن لا يجاوز حناجرهم، يقتلون أهل الإسلام، ويدعون أهل الأوثان يمرقون من الاسلام كما يمرق السهم من الرمية لئن ادركتهم لاقتلنهم قتل عاد). [١٧]

لە میانەی ئەم فەرمودە پیرۆزەوە دوو سیفاتی تاقمە ڕۆچووەكان دەردەكەوێت:

أ – تێنەگەیشتن لە قورئان، ئەمانە قورئان دەخوێننەوە بەبێ تێگەیشتن لە ماناو ڕاڤەكەی، ئەمەش وا دەكات ئەو ئایەتانەی دەربارەی بێباوەڕان هاتۆتە خوارەوە، ئەمان بەسەر موسڵماناندا جێبەجێی بكەن، ئەوەتا عەبدوڵای كوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) سەبارەت بە – خوارج – دەڵێت: (انهم انطلقوا الى ايات نزلت فی الكفار فجعلوها على المؤمنين). [١٨]

ب – بە كافردانان: هەندێك لەوانە كوشتنی موسڵمانانیان بە حەڵاڵ دەزانی (أبو قلابه) ڕەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی (ما ابتدع رجل بدعة الا استحل السيف) [١٩]

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت وتوویەتی: (طريقة أهل البدع يجمعون بين الجهل والظلم فيبتدعون بدعة مخالفة للكتاب والسنة وإجماع الصحابة، ويكفرون من خالفهم فی بدعهم). [٢٠]

---

[١٧] رواه البخاري ومسلم ، البخاري ٣٣٤٤ وە ٧٤٣٢ بڕوانە صحيح البخاري لاپەڕە ١٧٩٣، مسلم ٢٤٤٩ بڕوانە صحيح مسلم لاپەڕە ٤٧٣

[١٨] ذكره البخاري تعليقا ٨ / ٥١ بڕوانە صحيح البخاري باب قتل الخوارج و الملحدين بعد اقامة الحجة عليهم لاپەڕە ١٦٨٥

[١٩] (رواه الدارمي ١ / ٤٤ رقم ١٠٠ باب اتباع السنة. بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە٢٥

ڕێبازی خاوەن داهێنراوەكان دوو سیفەتی نەفامی و ستەم كردن لەخۆدەگرێت، داهێنانێك دێتە ئاراوە پێچەوانە بە قورئان و سونەت و كۆ دەنگی هاوەڵان، هەركەسێكیش پێچەوانەی داهێنانەكانیان بێت بە كافر لە قەڵەمی دەدەن.

دووەم: ڕۆچزونی بەشی كرداری.

ئەم جۆرە ڕۆچوونە بەندە بە بەشێك یان چەند بەشێك لە بەشەكانی كرداری شەریعەت، جا ئەو ڕۆچوونە بە وتەو زمان بێت، یان بە كردارو ئاكار، وەك: شەونوێژ.

گەر ڕۆچوونی بەشی كرداریی پەیوست بێت بە بیروباوەڕێكی خراپ و شێوێنراوەوە، ئەوا دەبێتە ڕۆچوونێكی تێكڕایی بیروباوەڕیی، وەك: دابڕان و نوێژ نەكردن لە مزگەوتی موسڵمانان‌دا، بەوەی بە مزگەوتی (ضرار) یان بزانرێت. هەروەها گەر ئەندازەو ڕێژەی ڕۆچوونی بەشی كرداریی فرە بوون، ئەوا دەگۆڕێن بۆ ڕۆچوونی تێكڕایی بیروباوەڕیی. پێغەمبەر (ﷺ) چارەسەری چەندین وێنەی ڕۆچوونی كرداریی كردووە كە لە سەردەمی خۆیدا ڕووی داوە، بواری ئاماژە پێكردنیمان نییە.

[٢٠] الرد على البكری ٢ / ٢٥٢ بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە٢٥

## بەشی دووەم: هۆكارەكانی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی لە ئایینیدا

هۆكارەكانی ڕۆچوون زۆرن، لێرەدا ئاماژە بە گرنگترینیان دەدەین بە كورتی:

١- نەزانینی حوكمی شەرعی: ئەمەش بۆ نەبوونی هوشیاریی ئایینیی و تێگەیشتنێكی قووڵ بۆ دەقە شەرعییەكان دەگەڕێتەوە، ئەو كەسانە جورئەتێكی كوێرانەیان بۆ دروست دەبێت و بێتێگەیشتن لە دەقە شەرعییەكان و زانینی مەبەست و پەیبردن بە نهێنیەكانی زمان و... هتد حوكم و فەتوای جۆراو جۆر دەدەن. بەواتایەكی دی نەزانینی حوكمی شەرعی خۆی لە چەند بوارێكدا دەبینێتەوە، وەك: نەزانین سەبارەت بە دەقەكانی قورئان و فەرموودە، نەزانینی ڕێباز و پەیڕەوی پێشین، نەزانینی مەبەست و حیكمەتی دەقە شەرعییەكان، نەزانینی حەقیقەتی ئیمان و پەیوەندیی بە كردەوەكانەوە، نەزانینی سوننەتەكانی خوای گەورەو.. هتد. هەریەك لەمانە سەنگ و كاریگەرێتی خۆی هەیە.

٢- تێكچوونی باری كۆمەڵایەتیی و شیرازەی ڕەوشت و دژایەتی كردنی دابونەریتە ئیسلامییەكان لە ژێر لافیتەی ئازادییدا بە یەكێك لە هۆكارەكانی ڕۆچوون دێتە ئەژماردن لەم سەردەم و قۆناغەدا، گەر بە نێو شەقام و بازاڕو زانكۆكاندا بگەڕێین و تەماشای زۆرێك لە كەناڵەكانی ڕاگەیاندن بكەین بەسانایی بۆمان دەردەكەوێت تا چ ئەندازەیەك شیرازەی كۆمەڵگا شێوێنراوە و سنوورە شەرعییەكان بەزێنراون.

٣- بەرتەسكردنەوەی بوار بۆ زانایان و بیریارانی ئیسلامیی میانڕەو و داخستنی زۆربەی دەروازەكان بە روویاندا، پاساوێكی باش و خزمەتێكی زۆرە بە هەزری ڕۆچووان و پەیامەكەیان، ڕۆچووان لەم قۆناغ و سەردەمەدا بە هێزترین پاساوو بەڵگەیان ئەو دژایەتییكردنەیە بە دین كە لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامییدا پیادە دەكرێت لە ژێر لافیتەو ناونیشانی جۆراو جۆردا. [٢١]

---

[٢١] بڕوانە التطرف والغلو، دكتور طارق محمد الطواری لاپەڕە ٧ - ٨.

٤- هۆكاری سیاسیی: بارودۆخی جیهانی ئیسلامیی و داگیركردن و بە تاڵانبردنی موڵك و سامان و دەستەڵاتی دیكتاتۆرانەو خۆسەپێنەرانە كە بە ئاگروئاسن فەرمانڕەوایەتی دەكەن لە چەندین وڵاتی ئیسلامییدا، زەمینەیەكی لەبارن بۆ سەرهەڵدان و گەشەكردنی هزرو بیرو بۆچونی ڕۆچووەكان، لە هەمان كاتدا دژایەتییكردنی ڕەوتی ئیسلامیی بە گشتیی و بوارنەدان بە ئیسلامییەكان و گرتن و ڕاونان و قەدەغە كردنی سیما ئیسلامییەكان لە هەندێك شوێندا پاساوو زەمینەسازیی بووە بۆ سەرهەڵدان و گەشەكردنی دیاردەی ڕۆچوون.

٥- سەپاندنی سیستم و پەیڕەوی ڕۆژئاوا لە ڕووی سیاسی و ئابوریی و كۆمەڵایەتیی و فێربوون و بوارەكانی تر، بە شێوازێكی كوێرانە بەسەر كۆمەڵگادا بێ ڕەچاوكردنی تایبەتمەندیی كۆمەڵگای ئیسلامیی لە ڕووی عەقیدەو بیروباوەڕو داب و نەریت و...هتد. هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ناسنامەی ئایینیی و كلتووری ڕەسەنی خۆی، ئەمە خۆی لە خۆیدا كارێكی ناڕەوایە و كاردانەوەی بە دوودادێت.[٢٢]

٦- بە ڕۆژئاواییكردن: دوای كۆتایی هاتنی سیاسەتی ئیستعماری سەربازیی، بە ڕۆژئاواییكردن و بە عەلمانی كردن جێگای گرتەوە، بەپێی پلان و بەرنامەیەكی ورد و داڕێژراوو هاوكاریی و كۆمەكی دەرەكی لە هەموو بوارەكاندا، لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی ئیسلامییدا. بە ڕۆژئاواییكردن بێ گوێدانە ئایین و كلتووری گەلان، جۆرێك لە كاردانەوە دروست دەكات، هەروەك مامۆستا تاریق البشری وتوویەتی: ڕۆچوون بە ئەندازەو شێوازی جیاجیا دەمێنێتەوە، لە ماوەو قۆناغە جیاجیاكان، تا ئەو كاتەی باڵادەستی بە ڕۆژئاواییكردن بمێنێت. ڕۆچوون لاواز دەبێت بە لاوازبوونی سیستم و دیاردە بە ڕۆژئاواییكردن.[٢٣] پێویستە هەماهەنگیی و

---

[٢٢] بڕوانە الغلو فی الدین، لاپەڕە ١٢١.

[٢٣] سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە

هاوکاریی لە هەموو بوارەکاندا هەبێت، لە نێوان جیهانی ئیسلامیی و رۆژئاوادا، ئەمەش لە قازانج و بەرژەوەندی هەموو لایەکدایە، بەڵام کۆپیکردنی ئەزموون و بیرو دید و بۆچوونیان دەبێتە مایەی گرفت و شێواندنی کۆمەڵگاو ئەمەش کاردانەوەی لێ فەراهەم دێت.

٧- باری ئابووریی: گەر تاماشای زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامیی بکەین کە زۆربەیان خاوەنی داهات و سامانێکی زۆر و زەبەندن، بەڵام دەبینین توێژو چینێکی دەستەڵات دار موڵك و سامانی وڵاتیان بۆ خۆیان و خانەوادەو گزیرەکانیان قۆرغ کردووە، دەستەڵاتی سیاسیان بە خراپترین شێوە بە کارهێناوە بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن و پاوان کردنی شادەمارەکانی ژیانی ئابووریی لە وڵاتدا. لەم لاشەوە چینێکی بەرفراوانی میللەت لە ژێر هێڵی هەژاریی و نەبوونیی دان و لە نێو قەیران و گرفتەکانی ژیاندا دەناڵێنن و کەسایەتیی و کەرامەتیان دەڕوشێنرێت.بڵاوبونەوەی دیاردەی بێکاریی لە نێو هەزاران لاو و دەرچوی زانکۆ و پەیمانگاکاندا و... هتد ئەم کێشانەو چارەسەرنەکردنیان، رق و قین لە نێو دڵ و دەرون و هەست و نەستی خەڵکدا دروست دەکات بەرامبەر بە دەستەڵات و دام و دەزگاکان و هاوپەیمانەکانی. لەم حاڵەتەدانەدا چینە بێبەشەکە بە سروشتی مرۆیی خۆی رقی لە دەوڵەمەند و دەستەڵاتدارە و بەسەرچاوەی ستەمی دەزانێت، لەبەر ئەوەی هەژاریی و نەبوونیی و بێبەشیی کاریگەری نەرێنی لە سەر لاشەو هزرو دەرونی مرۆڤ دروست دەکات و رقی لە دەستەڵات و پارێزەرانی دەبێتەوە. لەم هەلو مەرجانەدا زەمینە لە بارە بۆ سەرهەڵدان و گەشەکردنی دیاردەی رۆچوون و زێدەڕۆیی جا لە ژێر لافیتەی ئاییندا بێت، یان هەرناوو لافیتەیەکی تر.[٢٤]

---

[٢٤] بڕوانە التطرف والغلو ، دکتور طارق محمد الطواری لاپەڕە ٨-٩.

## بەشی سێهەم: شوێنەوار و كاریگەرێتی كێشەی رۆچوون و مەترسییەكانی

رۆچوون وەك دیاردەیەكی زیانبەخش كاریگـەرێتی خـۆی لەسـەر ئاسـتی تـاك و كۆمەڵ بەجێ دێڵێت لە چەندین بواری جیاجیادا، وەك بواری عەقیدە و بیروباوەڕ و لایـەنی كۆمەلایـەتیی و دەروونیـی و هەڵـسوكەوت و رەفتـارو...هتـد. لێـرەدا بەكورتی باس لە دوو جۆر لەو كاریگەرێتییانە دەكەین، لە دوو بەنددا.

### باسی یەكەم: شوێنەوارو كاریگەرێتی ڕۆچوون لەسەر عەقیدەو بیروباوەڕ

ڕۆچوون وەك لادان و تاوانێك كاریگەرێتی خۆی هەیە لەسەر عەقیدەو بیروباوەڕ، ئەمەش لە چەند خاڵێكدا خۆی دەبینێتەوە، لەوانە:

١- گومڕایی لە رێنوێنی خودا:

گـەر بڕوانینـە دەقـەكانی قورئـان و فـەرمودە بـە سـانایی ئـەم خاڵـەمان بـۆ دەردەكەوێت، ئەوەتا خـوای گـەورە پەیوەسـتبوونی بـە قورئـان و فـەرمودەوە بەسەرچـاوەی رێنـوێنی و هیدایـەت نـاوزەدكردووەو لـە بەرامبەریـشدا لادان و دووركەوتنەوە لێی مایەی گومڕایی و سەرلێشێواوی و خەشمی پەروەردگارە (فاما یأتینكم مني هدى فمن تبع هداي فلا یضل ولایشقى، ومن أعرض عن ذكري فإن له معیشة ضنكا ونحشره یوم القیامة أعمى) سوره طه: ١٢٣-١٢٤

جا ئەگەر هیدایەت و رێنموونیی من بۆ ئێـوە هـات، ئـەوەی شـوێنی بەرنامەكـەم بكەوێت، نە گومڕا دەبێت، نە ناخۆشیی و ناڕەحەتیی و ناسۆر دێتە رێی. ئەوەیش روو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بكات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە كەسانە ژیانێكی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە رۆژی قیامەتیشدا بە كوێریی حەشری دەكەین. (تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٣٢٠).

ئیبن عەباس (خوایان لێ رازی بێت) لە راڤەی ئەم ئایەتەی پێشوودا فەرمویەتی: (تضمن الله لمن قرأ القرآن واتبع ما فيه أن لا يضل في الدنيا ولا يشقى في الآخرة).[25]
بەواتای هەرکەس قورئان بخوێنێ و شوێنکەوتەی دەقەکانی بێت، لە دونیادا گومڕا نابێت و لە دوارۆژیشدا توشی ناسۆری و ناڕەحەتی نابێت.

٢– پەرتەوازبون (التفرق)

مەبەستی پیرۆزی شەریعەتی ئیسلام و ئامانجە باڵاکانی ئەوەیە، بڕواداران هاودەنگ و یەك دەنگ و یەك دڵ بن لەسەر حەق و پەیوەست بن بە کۆمەڵ، وریابن لە دوبەرەکی و پەرتەوازەبون.ئەوەتا خوای گەورە فەرموویەتی: (يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتنّ الا وأنتم مسلمون، واعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرّقوا). ال عمران: ١٠٢– ١٠٣.
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیەو هەمیشە پابەند و دامەزراوبن لەسەر ئیسلامەتی، بۆئەوەی هەر کاتێك مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن. (تەفسیری ئاسان، لاپەڕە٦٣).
هەروەها فەرمویەتی: (ولا تكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البينات، وأولئك لهم عذاب عظيم، يوم تبيض وجوه وتسود وجوه، فأما الذين اسودت وجوههم أكفرتم بعد ايمانكم، فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون، وأما الذين ابيضت وجوههم ففي رحمة الله هم فيها خالدون) ال عمران: ١٠٥–١٠٧.
نەکەن وەکو ئەو کەسانە بن کە ناکۆکیی و دووبەرەکییان لە ناودا بەرپابوو، لە یەکتر دابڕان، دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە روونەیان بۆ هاتبوو (کە سەرکەوتن لە یەکڕیزییدایە)، ئا ئەوانە سزایەکی گەورەو سەخت چاوەڕێیانە،

[25] رواه الطبراني ٢٢٥/١٦. بڕوانە مشكلة الغلو في الدين، لاپەڕە

ڕۆژێك دێت روخسارانێك سپی دەبن و روخسارانێك رەش هەڵدەگەڕێن، جا ئەوانەی كە روخساریان رەش هەڵگەڕاوە (پێیان دەوترێت) باشە، ئەوە ئێوە پاش ئیمانداری، پەشیمان بونەوەو رێبازی كوفرتان گرتەبەر؟! دە بچێژن سزا و ئازار بە هۆی كافربوونتانەوە. بەڵام ئەوانەی روخساریان سپی و گەش و جوانە لە ناو رەحمەت و میهرەبانیی خوادا ژیان دەبەنە سەر بۆ هەمیشە و بۆ هەتاهەتایی. (تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٦٣).

هەروەها فەرمویەتی: (وان هذا صراطي مستقيما فأتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله) (الانعام ١٥٣).

بە واتای ئەمە رێباز و بەرنامەی راستی منەو شوێنی كەون و شوێنی رێچكە و رێبازەكانی تر مەكەون، چونكە پەرتەوازەو جیاتان دەكاتەوە لە بەرنامەی خوا. دەبینین رێگای راستیی تەنها یەك رێگایەو مایەی بەختەوەریی و سەرفرازییە، بەڵام رێچكەو رێبازەكانی تر فرەو هەمەلایەنن و جوولەكەو گاور و ئاگرپەرست و هەموو رێچكەو دەستەو تاقمێكی گومڕاو سەرلێشێواوو ئەوانەی شوێنی گومان و هەواو ئارەزووەكانیان دەكەون دەگرێتەوە.

هەروەها فەرمویەتی: (ان الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعاً لست منهم في شيء، انما أمرهم الى الله، ثم ينبئهم بما كانوا يفعلون) الانعام ١٥٩.

بەواتای: بەراستیی ئەوانەی ئایینەكەیان بەش بەش كرد و بوونە دەستەدەستەو پارچەپارچە (بڕوایان بە هەندێك قورئان هەیەو هەندێكی تری پشتگوێ دەخەن)، ئەوە لە هیچ شتێكدا تۆ لەوان نیت، بەڵكو تۆ لەوان بەرییت، بەراستیی ئەوانە كاریان بۆ لای خوایەو تۆڵەی لادانیان لێدەستێنێتەوە، لەوەودوا هەواڵی هەمووئەو كارو كردەوانەیان پێ دەدات كە ئەنجامی دەدەن. (تەفسیری ئاسان).

ئەمەو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (... أما بعد فإن خير الحديث كتـاب الله، وخير الهدي هدي محمد، وشرّ الأمور محدثاتها وكل بدعة ضلالة) [٢٦]، (وكل ضلالة في النار). [٢٧]

حافیز ئیبن رەجەب رەحمەتی خوای لێبێت سەبارەت بە وتەی پێغەمبەر ﷺ(كل بدعة ضلالة) وتویەتی: ئەمە (جوامع الكلم)ە، واتـە كاكڵـەو پوختـەی وتەكانـەو بنەمایەكی گەورەیە لە بنەماكانی ئایین.. هەر كەسە شـتێكی داهێنـاو دایـە پـاڵ ئایین و لە بنەڕەت و بنەماكانی ئاییندا بوونی نەبوو، ئەوە گومڕاییەو ئـایین لێـی بەرییە، جا ئەو مەسەلەو بابەتانە لە بواری عەقیـدە، یـان كـردەوە، یـان وتـەی ئاشكراو پەنهانی بێت. [٢٨]

هەروەها ئیبن مەسعود (خوایان لێ رازیبێت) فەرمویەتی: (اننا نقتـدي ولا نبتـدي، ونتبع ولا نبتدع، ولن نضل ما تمسكنا بالأثر) [٢٩].

پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ فەرمویەتی: (تركت فيكم أمرين لن تضلوا مـا تمـسكتم بهما، كتاب الله وسنة نبيه). [٣٠]

دەبینین دەقی فەرمودەكان رێنوێنییمان دەكەن، هانمان دەدەن، تا پەیوەست و گـەردنگیر بـین بـە قورئـان و فـەرمودەوە، لـەو دوو سەرچـاوە چـاك و بێگـەردە لانــەدەین و زێــدەڕۆیی نەكــەین، هــەر لادانێــك دەرەنجامەكــەی گــومڕایی و

---

[٢٦] رواه مسلم في كتاب الجمعة، بڕوانە صحیح مسلم لاپەڕە ٣٨٩

[٢٧] رواه النسائي كتاب الصلاة العيدين باب كيفية الخطبة

[٢٨] جامع العلوم والحطم ٢٥٢، بڕوانە مشكلة الغلو ، ٦٦٢.

[٢٩] رواه اللالكائي في شرح أصول الاعتقاد ٨٦/١. سەرچاوەی پێشوو٦٦٣

[٣٠] اخرجه المالك في الموطأ (بلاغاً) كتاب القدر باب النهي عن القول بالقدر ٨٩٩/٢ والحاكم في المستدرك ٩٣/١، قال الألباني اسناده حسن في مشكاة المصابيح ٦٦/١. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ٦٦٠.

سەرلێشێواوی و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووە، چونکە بنچینەی گومڕایی شوێنکەوتنی گومان و هەواو ئارەزووە.

خوای گەورە سەبارەت بە لادان و گومڕایی گەلەکەی حەزرەتی موسا (علیه السلام) فەرمویەتی: (وإذ قال موسى لقومه يا قوم لم تؤذونني وقد تعلمون اني رسول الله اليكم فلما زاغوا أزاغ الله قلوبهم والله لا يهدي القوم الفاسقين) الصف: ٥.

بەواتای حەزرەتی موسا بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و هۆزم ئێوە بۆچی ئازاری رۆح و دڵم دەدەن، لە کاتێکدا بێگومان دەزانن کە من پێغەمبەر و رەوانەکراوی خوام بۆتان، جا کاتێك ئەوان گوێیان بۆ راستیی نەگرت و لە حەق لایاندا، خوایش دڵەکانیانی لە خشتەبرد و مۆری پێدانا، چونکە خوا رێنمویی قەوم و هۆزی تاوانکار و لە سنوور دەرچوو ناکات. تەفسیری ئاسان: ٥٥١.

هەرکەس لابدات لە رێبازی حەق دوای روونکردنەوەی رێنوێنی خودا (ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى ويتبع غير سبيل المؤمنين نُولّه ما تولّى ونصله جهنم وساءت مصيراً) النساء ١١٥.

هەرکەس دژایەتی پێغەمبەرﷺ بکات و لێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی رێگەی راست و دروستی بۆ روون بۆتەوەو رێبازێك بگرێتەبەر کە جیابێت لە رێگەو رێبازی ئیمانداران، ئەوە رووی وەردەچەرخێنین بۆ ئەو روگەو بەرنامەیەی هەڵی بژاردوەو رووی تێکردوە، (لە قیامەتیشدا) دەیخەینە ناو دۆزەخەوەو دەیسوتێنین، کە ئەویش سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە. (تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٩٧).

## باسی دووەم: شوێنەوارو كاریگەرێتی ڕۆچوون لەسەر دیدو بیروبۆچوون

ڕۆچوون چۆن شوێنەوارو کاریگەریەتی خۆی بەجێ دێڵێت لەسەر عەقیدەو بیرو باوەڕ، بەهەمان تەرز سەنگی خۆی هەیە لەسەر بیرو دیدو بۆچوونی خەڵکیی، لەم

دەستپێكەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك دەدەین كە شوێنەواری ڕۆچوونیان بە زەقی پێوە دیارە:

١ – جیاوازی و دژیەكی:

یەكێك لە نیشانەكانی شوێنكەوتەی پەیامی حەق، بەردەوامبوون و نەگۆڕان و دامەزراوییانە لەسەر حەق، چونكە سەرچاوەی وەرگرتنیان قورئان و فەرموودەیە بە تێگەیشتنێكی دروست، ئەم دوو سەرچاوە بێگەردەش دژیەكی تێدا نییە، خوای گەورەش فەرمویەتی (أفلا یتدبرون القرأن ولو كان من عند غیر الله لوجدوا فیه إختلافا كثیرا) النساء ٨٢. بە واتای (ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێكی نادەنەوەو لێی ورد نابنەوە ؟ خۆ ئەگەر لە لایەن كەسێكی ترەوە بولیە جگە لە خوا، بێگومان جیاوازیی و دژایەتیەكی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە) تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٩١.

٢ – شێواندنی وێنەی ئیسلام و موسڵمانان.

ئیسلام ئایینی چاودێریی و پاراستنی بەرژەوەندییەكان و وەلانان و دوورخستنەوەی زیانەكانە. هەر بۆیە پاراستنی ئایینی ئەم ئومەتە لە هەر ڕەخنەو پلارو توانجێك كە بێباوەڕان و نەیاران ئاڕاستەی دەكەن، ئەرك و بەرپرسیارێتی بڕوادارانی نەتەوەی ئیسلامە، لە دەروازەی (سد الذرائع) بە واتای بەرگرتن و داخستنی بەهانەو پەڵپ و پاساو، لە كاتێكدا ئەو كارانە لە بنەڕەتدا دروست و ڕێپێدراوە، بەڵام قەدەغە دەكرێت و بواری نادرێتێ لەبەر بەرژەوەندی، وەك ئەوەی خوای گەورە، لێمان قەدەغە دەكات قسەو جنێوو تانەو تەشەر بدەین لە بتەكان و خوا دەسكردەكانی بێباوەڕان، تا نەبێتە پاساوو بیانو بۆ بێباوەڕان قسەو جنێو بە خوای گەورە بدەن، (ولاتسبوا الذین یدعون من دون الله فیسبو الله

عدوا بغير علم كذلك زينا لكل أمـة عملـهم ثـم الى ربهـم مـرجعهم فينبـئهم بمـا كـانوا يعملون) الانعام ١٠٨.

((ئەی ئیمانداران) نەکەن جوێن بدەن بەو بت و شتانەی کە (نەفامان) هاواری لێ دەکەن و دەیپەرستن بێجگە لە خوا، نەوەکو ئەوانیش بـە ناهـەق و بـە نـەفامی جوێن بدەن بە خوا (چونکە ئەوانە) نایناسن و قەدری نازانن، ئا بەو شێوەیە ئێمە بۆ هەر گەلو ئوممەتێك کردەوەکەیانمان ڕازاندۆتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەیان هەر بۆ لای پەروەردگاریانە، ئەوسا ئاگاداریان دەکاتـەوە بـەو کـارو کردەوانـەی کـە دەیانکرد) تەفسیری ئاسان لاپەڕە ١٤١.

دەبێت ئەو ڕاستییە لە یاد نەکـەین, ئـەو کەسـانەی بـە نـاوی ئایینییـەوە کـارو کردەوەیەك دەنوێنن, خەڵکیی کارەکەیان دەداتـە پـاڵ ئایینەکـە, گـەر کەسـێك ڕۆچوو بێ و ئایین لە سەرخۆی و خەڵکی توند بکات, فەرمانی توند وستەم لە سەر خەڵکیی دەر بکات, خەڵکیی کارەکـەی ناداتـە پـاڵ خـۆی، بـەڵکو دەیداتـە پـاڵ ئایینەکەی, ئەمەش دەکرێتە پاساوێك بۆ دژایەتی کردنی ئایین....

ڕۆچوون و توندیی هەندێ کەس و لایەن بە ناوی ئایینەوە، بۆتە مایەی شێواندن و لەکەدار کردنی ئیسلام و موسڵمانان لەم قۆناغ و سەردەمەدا, هەروا بۆتە پاساوێك ناحەزانی ئیـسلام لێیـەوە دزە دەکـەن ودژایـەتی ئیـسلام دەکـەن, گـەر ڕەفتـارو ئاکاری ئەو جۆرە کەسانە نەبوایە, ئەوانیش نەیاندەتوانی بەم شێوەیە جورئـەت بدەنە خۆیان و دژایەتی ئیسلام بکەن.

٣- دوورکەوتنەوەو سڵەمینەوەلە ئیسلام:

ئیـسلام ئـایینی لێبـوردەیی وئاسـانکارییە, ئەمـەش سـیمای ڕوون و پرشـنگداری ئیسلامەو بەمەش لە ئایینەکانی تر جودا دەکرێتـەوە, بـۆ ئـەم مەبەسـتە خـوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی (الذين يتبعون الرسول الـنبي الامـي الـذي

يجدونه مكتوبا عندهم فى التوراة والانجيل يأمرهم بالمعروف وينهاهم عن المنكر و يحل لهم الطيبات و يحرم عليهم الخبائث و يضع عنهم إصرهم والاغلال التي كانت عليهم فاالذين امنوا به وعزروه ونصروه واتبعوا النور الذى انزل معه أولئك هم المفلحون). الاعراف١٥٧.

ئەوانەی كە شوینی ئەم (محمد ﷺ) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەكەون ئەوەی كە (گاور و جوو ناونیشانیان) دەستیان دەكەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا, فەرمانیان پێدەدات بە چاكەو قەدەغەی گوناه و خراپەیان لێ دەكات و هەرچییەك پاك وچاكە بۆیان حەڵاڵ دەكات و هەرچی پیس و نا پوختە لێیان حەرام دەكات و ئەركە قورس و سەنگینەكان لە سەر شانیان لادەبات, ئەو كۆت وزنجیرانەش كە لە سەریان بو لادەبات (وەكو خۆكوشتن لە كاتی تەوبەدا... هتد) جا ئەوانی باوەڕیان پێ هێناوەو پشتیوانیان لێ كردووەو پشت گیریان لێ كردووە و شوێنی ئەو نوورە كەوتون (كە قورئانە) و هاورێ لە گەڵیدا رەوانە كراوە, هەر ئەوانە سەرفرازو رزگارن) تەفسیری ئاسان ١٧٠

هەروەها فەرموویەتی: (وما جعل عليكم فى الدين من حرج) الحج ٧٨.

لەم ئایین و بەرنامەیەدا هیچ جۆرە شتێكی نارەواو قورس و گرانی لەسەر دانەناون كە نەتوانن ئەنجامی بدەن. (تەفسیری ئاسان ٣٤١).

هەروەها فەرمویەتی (يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر) البقرة ١٨٥

بە واتای (خوا ئاسانكاریی بۆ ئیوە دەوێت و نایەوێت (پەرستن و فەرزەكانتان) لەسەر قورس و گران بكات) تەفسیری ئاسان، لاپەڕە ٢٨.

ئیسلام ئایینێكە لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدایە، هەر كەسێك ئەم ئایینە بناسێتەوە، ئەوا موسڵمان دەبێت و ئایینەكەی خۆش دەوێت، گەر ئیرەیی و خۆ بەگەورە زانین بەرۆكی نەگرێت...

ئەركی موسڵمانانە لەم سەردەم و قۆناغەدا بە شێوەیەكی جوان و شیرین ئیسلام بخەنە ڕوو شێوازی بانگەوازی نوێ و كاریگـەر بـەكار بێـنن، شـێوازێك نەگرنەبـەر ببێتـە مایـەی لەكـەو ناشـیرینكردنی ئیسلام، ئیـسلام چـۆن خـۆی پـەیامی هـەق و ڕاسـتییە، ئاوهـاش دەبێـت پارێزەرەكانی دڵسۆزو زیرەك و هوشیار بن و بانگەوازو داواكەیان نەدۆڕێنن.

موسـڵمانان دەبێـت ڕەوشـت و كردارەكانیـان ڕەنگدانـەوەی پەیامەكـەیان بێـت، چونكە ڕەوشت و كرداری جوان لە هەموو هۆكارێكی تـر زیـاتر كاردەكاتـە سـەر خەڵكیی و پەندی لێ وەردەگیرێت، نەك گوتاری بێكردار لە زیـان بـەولاوە هیـچی تری لێ نایەتە دی.

ئەوەتا خوای گەورە فەرمویەتی (فبما رحمة من الله لنت لهم ولو كنت فظا غلـيظ القلب لا نفضوا من حولك، فاعف عنهم واستغفر لهم و شاورهم فی الامر فأذا عزمت فتوكل على الله إن الله يحب المتوكلين) آل عمران ١٥٩.

كەوابوو (ئەی محمد ﷺ) بـەهۆی ڕەحمـەتی خواوەیـە تـۆ نـەرم و هـێمن بویـت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورەو قسە ڕەق و بێبـەزەیی بوویتایـە، ئـەوە هـەموو لـە دەورت بڵاوەیـان دەكـرد، كەواتــە چاوپۆشـییان لێبكـەو لێیــان ببــورەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكە، لە كارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بكە (دوای مەشورەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارت دا (كارێك ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بە خـوا ببەستە، چونكە بەڕاسـتیی خـوا ئەوانـەی خۆشـدەوێت كـە پـشتی پێدەبەسـتن) تەفسیری ئاسان، لاپەڕە ٧١.

ماوتەوە بڵێم ڕۆچوونی هاوچەرخ لە زۆر شوێندا شێوەو سیمای ئیسلامی ناشیرین كردووە, ئەوەی ڕۆچووەكان دەیكەن و دەیڵـێن و دەینووسـن, خـۆی لـە خۆیـدا لادانە لە ئیسلام, بەڵام بێباوەڕ و نەفامـەكان ئـەو كـارو كردەوانـە دەدەنـە پـاڵ ئیسلام نەك ڕۆچووەكان, ئەمەو ناحەزانی ئیسلام بە درێژایی مێژووی كۆن و نوێ,

بیرو دیدو بۆچوونی ڕۆچووەكانیان كردۆتە دەسكەلای دەستیان و لە میانەیانەوە دژایەتی خودی ئیسلام و موسڵمانانیان كردووە بە گشتیی.

٤– لە دەستدانی میانەیی ئیسلام:

هەر كاتێك ڕۆچوون و زێدە ڕۆیی و بیدعە لە هەر كۆمەڵێكدا تەشەنەی كردو بڵاو بووە, ئەو كات میانەیی و سوننەت لە دەست دەچێت, بە پێی ڕێژەی ئەوڕۆچوون و بیدعەیە، واقیعی كومەڵگای موسڵمانان بە درێژای مێژوو ئێستاشی لە گەڵدایێت شایەتی ئەم حاڵەتەیە.

حەسانی كوری عەتییە فەرموویەتی (ما ابتدع قوم بدعة فی دینهم, الا نزع الله من سنتهم مثلها, ثم لا یعیدها علیهم الی یوم القیامة)[31].

ئەبو ئیدریسی خەولانی ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی: (ما احدثت امة في دینها بدعة, الا رفع الله بها عنهم سنته)[32].

بۆیە دەبینین هاتنە كایەی هەر بیدعەو داهێنانێك لە ئاییندا, لادانەو بازدانە بەسەر دەقە شەرعیەكاندا, دەرئەنجامەكەشی یان زێدە ڕۆییە، یان كەمتەرخەمیی و شلگیریی, كە پێچەوانەیە بە میانەیی ئیسلام وبەرنامە ناوازەكەی.

–عن ابی درداء– رضي الله عنه أنه قال: (لو خرج رسول الله (ﷺ) الیكم الیوم ما عرف شیئا مما كان علیه هو و أصحابه الا الصلاة).

– قال الأوزاعی: فكیف لو كان الیوم ؟

– قال عیسی بن یونس: فكیف لو أدرك الأوزاعي هذا الزمان.[33]

ئەی ئێمە دەبێت چی بڵێین لەم قۆناغ سەردەمە ناهەموارەی موسڵمانانی تێدا دەژین.

---

[31] بڕوانە الاعتصام لاپەڕە ٧٢.

[32] ذكره الشاطبی في الاعتصام لاپەڕە ٧١

[33] رواه ابن وضاح في البدع والنهي عنها ٦١. بڕوانە مشكلة الغلوا في الدین٧٠٠–٧٠١

## بەشی چوارەم: چارەسەری کێشەی رۆچوون

### باسی یەکەم: بەرنامەی ئیسلام بۆ چارەسەری کێشەی ڕۆچوون

لە میانەی تێڕوانین بۆ دەقە شەرعییەکان و وتەو ڕاڤەی زانایانی و چۆنیەتی چارەسەر کردنی ئەم دیاردە دزێوە، بۆمان دەردەکەوێت کێشەگەلێکی وا پێویستی بە چەندین ڕێساو بنەما هەیە، بۆ هەرکەس و لایەنێك ویستی چارەسەری ئەم دیاردەیە بکات.

زۆرجار ئەوانەی سەرەڕۆیانەو بێ بەرنامەیەکی ڕاست و دروست ویستویانە چارەسەری قەیرانی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی بکەن کەوتوونەتە نێو هەڵەو لادانی ترەوە.. لەبەر پێویستی بابەتەکەمان ئاماژە بە گرنگترین بنەماو پێوەندەکانی دیارییکردنی چارەسەری ڕۆچوون دەکەین بە پێی بەرنامەی ئیسلام لە چەند بەندێکدا:

### بەندی یەکەم: سەرچاوەی دیارییکردنی رۆچوون و زێدەڕۆیی شەریعەتی ئیسلامە

لە کاتی ڕوودانی هەر کێشەیەکدا، پێویستمان بە سەرچاوەیەك هەیە تا هەمووبۆ لای بگەڕێینەوەو لە سنوری فەرمانەکانیدا ڕاوەستین، ئەم پێوەرو سەرچاوەیە دەبێت لەسەری کۆك بین و هاوڕابین. بۆ چارەسەری ئەمەش جگە لە قورئان و فەرمودە، پێوەرێکی ترمان نییە، ئەوەتا شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی:

(ان الناس لا يفصل بينهم النزاع الا كتاب منزل من السماء، واذا ردوا الى عقولهم، فلكل واحد منهم عقل).[٣٤]

---

[٣٤] درء تعارض العقل والنقل ١ / ٢٢٩ بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ٧٧٢

خـوای گـەورەش بـۆ چارەسـەری جیـاوازی کێـشەکان ئاگـاداری کردوینەتـەوە فەرمویەتی (وان تنازعتم فی شئ فـردوه الی الله والرسـول ان کنـتم تؤمنـون بـالله والیوم الاخر ذلك خیر واحسن تأویلا) النساء ٥٩ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربـارەی حـوکمی خـوایی ئـەوە ئـەو کێـشەیە بگێڕنـەوە بـۆ لای خـواو پێغەمبەرەکەی، کە (قورئان وە سونەت دەگەیەنێت) ئەگەر ئێـوە باوەڕتـان بـە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جـوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان (تەفسیری ئاسان)

کێشەی ڕۆچـوون لـە ئاییـندا، مـادام کێـشەکە پەیوەسـتە بـە ئاییـنەوە دەبێـت سەرچاوە بۆ چارەسەری کێشەکەش هەر ئاین بێت بۆ ئەوەی بگەینە فەرمانێکی ڕاست و دروست و دادپەروەرانە – لە میانەی دەقە شەرعییەکانەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی ئایا ئەو دیاردەیە یان ئەو رەفتارە، ڕۆچوون و زێدەڕۆیی تێدایە یان نا؟ بۆ فەرماندان لەسەر کارو کردارێك یان وتە و قسەو باسێك، گوایە ئەمە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕۆچوون، پێویست دەکات و وادەخوازێت ئەو کارە لێکدانەوەی بۆ بکرێت و تەماشای دەقە شەرعییەکان و ڕەچاوکردنی واقع بکرێت، تا بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەم کارە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی زێدەڕۆیی و ڕۆچوون.

ئەو کات پێویست دەکات دیراسەی دەقەکان بکەین، بۆ زانینی هۆکاری ئەو لادان و ڕۆچوونە و فەرماندان لەسەر ئەو کەسەی کە زێدەڕۆیی کردووە، دیـارییکردنی شێوازی مامەڵە کردن لەگەڵیدا، هەموو ئەمانە وا دەخوازێت بگەڕێینەوە بۆ سەر دەقەکانی شەریعەت، نەك یاسا دانراوەکـان، چـونکە یاسـاکان زۆر جـار خۆیـان پێچەوانەن بە دەقەکانی شەریعەت. ناکرێـت بکرێنـە پێـوەر بـۆ چارەسـەرکردنی کێشەیەك کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە.

جا گەر ئایین كرا بە پێوەرو سەرچاوە، ئەو كات ڕۆڵی زانایانی ئیسلام و بانگخوازان گرنگ و هەستیار دەبێت و دەبێت هەست بە ئەرك و ڕۆڵی سەرشانیان و بەرنامەڕێژیی بكەن بۆ چارەسەری ئەم كێشە ترسناكە.

لەم بارەیەوە شەیخولئیسلام ئیبن تەیمییە رەحمەتی خوای لێبێت وتوویەتی: (... فكل من لم يناظر أهل الالحاد والبدع مناظرة تقطع دابرهم، لم يكن أعطى الأسلام حقه، ولا وفى بموجب العلم والايمان، ولا حصل بكلامه شفاء الصدور، وطمأنية النفوس، ولا أفاد كلامه العلم واليقين). [٣٥]

جا ئەوانەی وتووێژو گفتوگۆ لەگەڵ بێباوەڕو زێدەڕۆو كەسانی بیدعە چیدا دەكەن، دەبێت لە ئاستێكی وادابن پاساوو بەڵگەكانیان پووچ بكەنەوە، بە بەڵگەی ڕاست و دروست و زانستیانە، جوانیی و ڕەونەقی ئیسلام نیشاندەن و ئارامی و دڵنیایی ببەخشنە دڵ و دەروونەكان. دەبێت ئەو ڕاستییە فەرامۆش نەكەین، گەر ئەو كەسەی وتووێژیان لەگەڵدا دەكات لە ئاستی پێویستدا نەبوو، شیاوو بەهرەدار نەبوو، دەرەنجامی خراپ و لاوازی لێ فەراهەم دێت، چونكە ڕۆچووەكان لەو بوارەی خۆیاندا كە زێدەڕۆییان كردووە شارەزایی و پسپۆڕییان پەیدا كردووەو بەڵگەو پاساویان بۆ خۆیان كۆكردۆتەوە. جا ئەگەر بەرامبەرەكەیان لاواز بوو، توانای زانستیی كەم بوو، كارەكە لە دوو جۆری فیتنەوە سەر دەردەكات. یەكەم: كەسی ڕۆچوو وا هەست دەكات براوەیەوحەق و ڕاستیی لەگەڵدایە، چونكە بەرامبەرەكەی بەڵگەی بەدەستەوە نییە، دووەم: ئەو كەسەی وتووێژی لەگەڵدا كردوون دەكەوێتە گومانەوە لەو حەقەی كە پێیەتی، چونكە گومانی بەرامبەر كاری لێ دەكات و ئەمیش توانای وەڵامدانەوەی نییە،

[٣٥] درء تعارض العقل والنقل ١ / ٣٥٧ والفتاوى ٢٠ / ١٦٤ – ١٦٥ بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە٧٨١

دەرەنجام بە زیانی موسڵمانان گفتوگۆكە كۆتایی دێت. ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێك مەعازی كوڕی جەبەل دەنێرێت پێی دەڵێت: (إنك ستأتی قوما أهل الكتاب).[٣٦] ئیبن حەجەر ڕەحمەتی خوای لێبێت لەم بارەیەوە فەرمویەتی: ئەمە ڕاسپاردەو بەرچاو ڕوونییە، چونكە خاوەن كتێبەكان خاوەن زانستن، ناكرێت لە وتووێژكردن لەگەڵیاندا وەك چۆن لەگەڵ نەفام و بتپەرستاندا دەدوێین ئاوها گفتوگۆیان لەگەڵدا بكەین. شەیخولئیسلام ئیبن تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێت سەبارەت بەوەی هەندێ لە موعتەزیلییەكان كە وەڵامی زەندیقەكانیان دەدایەوەو وتووێژیان لەگەڵ دەكردن وتویەتی (والعجب من قوم أرادوا بزعمهم نصر الشرع بعقولهم الناقصة و أقیستهم الفاسدة، فكان ما فعلوه مما جرأ الملحدین أعداء الدین علیه، فلا الاسلام نصروا ولا الاعداء كسروا).[٣٧]

بە واتای مایەی سەرسوڕمانە كەسانێك بیانەوێت شەریعەتی خوا بە عەقڵە ناتەواو و قیاسە خراپ و نادروستەكەیان سەربخەن، ئەو كارانەی كە دەیكەن بێباوەڕان و دوژمنانی ئایین لێی سودمەند دەبن و جورئەت پەیدا دەكەن بۆ دژایەتی كردنی ئایین، بە كارەكانیان نە ئیسلام سەردەكەوێ و نە دوژمنانیش شكست دێنیٚ

ماوەتەوە بڵێین مەسەلەی زانست مەسەلەیەكی ڕێژەییە، بەپێی جیاوازیی خەڵكەكان و جیاوازیی ئەو كێشانەی دەخرێتە ڕوو دەگۆڕێت. هەندێك زێدەڕەویی ڕووكەش و دیارە، دەكرێت قوتابیەكی زانستە شەرعییەكان وەڵامی بداتەوە و چارەسەری بكات، بەڵام گەر ڕۆچوونەكە وردو قوڵ بوو، ئەوە تەنها زانایانی پسپۆڕ دەبێت لەو بارەیەوە بدوێن و چارەسەری گونجاوی بۆ دابنێن. ئەمە جگە لە زانستە شەرعییەكان دەبێت، چارەسەركەر شارەزای هەلومەرج و واقیعی حاڵ

[٣٦] رواه البخاري ومسلم، بروانە صحیح البخاري ١٤٩٦ و ٤٣٤٧ ل ٤١٧ و ١٠٩٧

[٣٧] مجموع الفتاوی (٩ / ٢٥٣) بڕوانە مشكلة الغلوا في الدین لاپەڕە٧٨٢

بێت و شارەزای پلەبەندیی –المصالح والمفاسد– چاكەو بەرژەوەندییەكان و خراپەو زیانەكان بێت.

## بەندی دووەم: چارەسەركەر شیاوبێت بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی چارەسەركردن

چارەسەركردنی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی یەكێكە لەو كارە هەستیارانەی كە پێویستە كەسانی شیاوو لێهاتو پێی هەستن تا ئامانجەكانی خۆی بپێكێت، چارەسەركەر دەبێت ئەم سیمایانەی لەخۆ گرتبێت.

١ – دڵسۆزیی و نییەتپاكیی: نیەت پاكی بنچینەی قبوڵبوونی كردەوەكانی مرۆڤە لەلایەن خوداوەندەوە، هەر بۆیە فەرمویەتی (وما أمروا الا ليعبدوا الله مخلصين له الدين) البينة ٥.

فەرمانیشتان پێ نەدرابوو جگە بەوەی كە خواپەرستی بكەن و بەپاكیی و دڵسۆزیی و ملكەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەكەی بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن. (تەفسیری ئاسان)

هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (انما الاعمال بالنيات، وانما لكل امرئ ما نوى)[٣٨]. دڵسۆزیی و نیەتپاكیی لێرەدا ئەوەیە چارەسەركەر بەكارەكانیی ڕەزامەندیی خواو ڕۆژی دوایی لامەبەست بێت و گەیشتن بە حەق و هێنانی خەڵكیی بۆ لای حەق و سەروەریی بۆ دینی خوا لەسەر زەوییدا ئاوات و ئامانجی بێت. نیەتخراپی شێوازی زۆرە، وەك: خۆ بەگەورەدانان و بەرژەوەندیی دونیاو ستەمكردن لە دەستەو تاقمێك و ڕكابەرایەتیی و.... هتد

---

[٣٨] رواه البخاري ومسلم

٢ – زانست

چارەسەرکەری ڕۆچوون و زێدەڕۆیی ڕووبەڕووی کێشەیەکی فرەڕەهەند دەبێتەوە، ئەمەش وا دەخوازێت زانیاریی تەواوی هەبێت بە کێشەکان و لە هەموو ڕوویەکەوەو توانای وەڵامدانەوەی گومانی ڕۆچووەکانی هەبێت.

بۆ ئەم مەبەستە پەروەردگاری مەزن فەرمویەتی (ومن الناس من يجادل فى الله بغير علم ولا هدى ولا كتاب منير) الحج: ٨. هەندێك لە خەڵكیی هەن موجادەلە دەربارەی زاتی خواو سیفاتە پیرۆزەکانی دەکەن دوور لە هەموو زانست و زانیاریی و بۆچوون و کتێب و سەرچاوەیەکی ڕوون و ئاشکرا.

## بەندی سێهەم: هاوسەنگیی و گەڕانەوە بۆ میانەیی

ڕۆچوون و زێدەڕۆیی لادانێکە و لە بەرامبەریدا لادانێکی تر هەیە، ئەویش پشتگوێخستن و کەمتەرخەمییە.. لە کاتی چارەسەری لادانی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی، هەندێکجار خەڵکیی پەنا دەبەنە بەر لادانی بەرامبەر کە بریتییە لە کەمتەرخەمی و گوێنەدان.. زۆرجار خەڵکانێك توشی توندی و زێدەڕۆیی دەبن، بەڵام دواتر کە واز لە زێدەڕۆیی دێنن خۆیان لە ناوەندو میانگیرییدا ناگرنەوەو خلۆر دەبنەوە بەرەو فتوورو لاوازیی و شلڕەویی. زانایانیش لەم بارەوە وتوویانە کاری ئەمانە بریتییە لە: (جماع الشر: تفريط في حق او تعد الى الباطل. وهو تقصير فى السنة، أو دخول فى البدعة، كترك بعض المأمور وفصل بعض المحظور، أو تكذيب بحق، وتصديق بباطل).[٣٩]

[٣٩] بروانە مشكلة الغلو فى الدين ٧٨٤

بۆ چارەسەركردنی زێدەڕۆیی و كەمتەرخەمیی گەڕانەوەیە بۆ میانڕەویی ئیسلام، وەك خوای گەورە فەرمویەتی (وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا) البقرة ١٤٣

بەم شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێكی میانڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەكەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستییەوە، لە ڕووی دونیاو قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازییەكانی ڕۆح و نەفسەوە... هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵكەوە (تا بزانین ئەم ئایین وبەرنامەیە هەمووی مایەی خێرو سەربەرزییە بۆ تاك و كۆمەڵ لە هەموو سەردەمێكداو لە هەموو بوارەكانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش لە هەمووئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات بۆ (دڵسۆزانی ئومەتی، لەسەرئەوەی بە ئەركی سەرشانی خۆیان هەستاون). (تەفسیری ئاسان)

ئیمامی تەبەری لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت خوای گەورە ئەم نەتەوەیەی بە میانڕەویی وەسف كردووە، چونكە ئاوینەكەیان میانڕەوە، نە وەك گاورەكان زێدەڕەون. وەك وتەكانیان سەبارەت بە حەزرەتی عیسا (عليه السلام)، نە وەك جوولەكەكان كە كەم تەرخەمیی و گوێ نەدانە ئایین سیماو ئاكاریان بوو، كتێبی خوایان دەگۆڕی و پێغەمبەرانیان دەكوشت و بەدرۆیان دەخستنەوە).[٤٠] ئەمەو موسڵمانان لە نوێژەكانیاندا بە بەردەوام لەخوا دەپاڕێنەوە بەم ئایەتە (اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين) الفاتحة ٦ – ٧.

ڕێگای ڕاست و دروستیش میانڕەوی ئیسلامە، كە هەردوو جۆری لادان، زێدەڕەویی و بەزایەدان ڕەت دەكاتەوە.

---

[٤٠] بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ٧٨٥

**بەندی چوارەم: تەماشاكردنی ئەو ڕەچاوكردنانەی كە جیاوازیی فەرماندان لەسەر زێدەڕۆو زێدەڕۆیی لەسەر بینا دەكرێت.**

ئەم ڕەچاوكردنانەش خۆی لە چەند خاڵێكدا دەبینێتەوە كە ئەمانەن:

١ – جیاكردنەوە لە نێوان ڕۆچوونی پێكافربوون و ڕۆچوونی پێ كافر نەبوون.

٢ – جیاكردنەوە لە نێوان ڕۆچوون لە كارێكی بەشییدا لەگەڵ ڕۆچوون لە كارێكی تێكڕاییدا.

٣ – جیاكردنەوە لە نێوان ڕۆچووەكان بە پێی زانینیان یان نەزانینیان.

٤ – جیاكردنەوە لە نێوان ڕۆچووەكان بەپێی ئیجتیهادكردنیان یان لاسایی كردنەوەیان.

٥ – جیاكردنەوە لە نێوان ڕۆچووی – متأول – لێكدەرەوە و ڕۆچووی لێك نەدەرەوە.

٦ – جیاوازیی لە نێوان بانگەشەكردن بۆ ڕۆچوون و كەسانێك بانگەوازی بۆ ناكەن.

٧ – جیاوازیی لە نێوان ڕۆچووی جەنگاوەرو شەڕكەرو ئەوانەی شەڕكەر نین.

لەبەر سروشتی كورتیی باسەكەمان ناتوانین ئەم بڕگانە شی بكەینەوەو تەنها ئاماژەیەكی خێرامان پێدا. [٤١]

[٤١] بڕوانە مشكلة الغلو في الدين لاپەڕە ٧٧١.

## باسی دووەم: چارەسەری ڕۆچوون لەبواری عەقیدە و بیروباوەڕ

ئەم جۆرە چارەسەرە ڕۆڵ و بایەخی خۆی هەیە و لە چەند بڕگەیەكدا ڕوونی دەكەینەوە:

**یەكەم: گەردنگیریی و پەیوەستبوون بە قورئان و فەرموودە.**

قورئانی پیرۆز كتێب و بەرنامەی ڕێنوێنییە بۆ مرۆڤایەتیی و پەیوەستبوون پێوەی، فەرمانی پەروەردگارەو سەرچاوەی بەختەوەریی و سەرفرازییەو چارەسەرە بۆ كێشەو جیاوازییەكان، چەندین دەقی قورئان و فەرموودەمان لە بەردەستدایە بۆ سەلماندنی باسەكەمان لەوانە:

١ – خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی (وأطيعوا الله وأطيعوا الرسول واحذروا فأن توليتم فاعلموا أنما على رسولنا البلاغ المبين) المائدة ٩٢. ئەی ئیمانداران فەرمانبەرداری خوابن، فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بن و وریا بن و ئاگادار بن (نەكەن سەرپێچی لە فەرمان و ڕێنموویەكانیان بكەن) جا ئەگەرپشت هەڵكەن و یاخیی ببن ئەوە بزانن بە ڕاستیی كاری پێغەمبەری ئێمە تەنها ڕاگەیاندنی ئاشكراو ڕوونی پەیامەكەیە (تەفسیری ئاسان).

٢ – هەروەها فەرمویەتی (يا أيها الذين أمنوا وأطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الامر منكم فأن تنازعتم فى شئ فردوه الى الله والرسول ان كنتم تؤمنون بالله واليوم الاخر ذلك خير وأحسن تأويلا) النساء ٥٩.

ئەگەر لە شتێكدا بوو بە كێشەتان دەربارەی حوكمی خوایی، ئەوە ئەو كێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی كە (قورئان و سوننەت دەگەیەنێت) ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە (ڕەفتاركردنتان) بەو شێوەیە چاكترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری كێشەكانتان (تەفسیری ئاسان)

٣ – پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (يا أيها الناس: إني تركت منكم ما إن اعتصمتم به فلن تضلوا أبدا كتاب الله وسنتي).[٤٢]

٤ – پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (اوصيكم بتقوى الله، والسمع والطاعة وإن عبد حبشي فانه من يعش منكم يرى اختلافا كثيرا واياكم و محدثات الامور، فانها ضلالة فمن ادرك ذلك منكم فعليه بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين، عضوا عليها بالنواجذ).[٤٣]

چەندین دەقی قورئان و فەرموودەمان هەیە، کە داوامان لێ دەکات پەیوەستبین بە قورئان و فەرمودەوە، چونکە سەرچاوەی ڕێنوێنی و سەرفرازیی مرۆڤە لە دونیاو قیامەتدا.

ڕۆچوون و زێدەڕۆیی لادانە لە قورئان و فەرموودەو چارەسەریش بریتییە لە گەڕانەوە بۆ سەر دەقەکانی و خۆپاراستنیش لە زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی و لادان پەیوەستبوون و گەردنگیرییە بە قورئان و فەرمودەوە.

**دووەم: پەیوەستبوون بە ڕێچکەی پێشین و ئەهلی سوننەت و جەماعەت.**

بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەو لادان لە ڕێچکەی پێشین و ئەهلی سوننەت و جەماعەت، زێدەڕۆیی و لادان و کەمتەرخەمیی و بیدعە دێتە ئاراوە، ڕێچکەی پێشین ڕێچکەیەکی میانڕەوەو پەیوەستە بە دەقەکانەوە، شوێنکەوتەی هەواو ئارەزوو نییە.

**سێیەم: زانینی ڕاستێتیی ئیمان و پەیوەندیی بە کردەوەکانەوە.**

قورئان و فەرموودە ئەوەیان یەکلا کردۆتەوە، کە کردەوە چاکەکان بەشێکە لە بەشەکانی بڕوابوون (وما كان ليضيع ايمانكم) البقرة ١٤٣

---

[٤٢] أخرجة مالك فى الموطأ و الحاكم فى المستدرك. بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە٦٦٠.

[٤٣] رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح ٢٦٨٥ بڕوانە سنن الترمذى لاپەڕە ٧٦٨.

بێگومان خوا ئیمان و باوەڕداریی (نوێژ)تان زایە ناکات.

گوناه و تاوانیش بەشێکە لە بەشەکانی کوفر، وەك پێغەمبەری خوا فەرمویەتی (ﷺ): (سباب المسلم فسوق، وقتاله کفر).[٤٤]

جنێودان بە موسڵمان دەرچوونە لە ئیسلام و جەنگین لەگەڵیدا کوفرە.

ناوەڕۆك و مەبەستەکان بریتییە لەوەی کە خەڵکی سیفاتی ئیمان و کوفری پێکەوە تێدا کۆدەبێتەوە، کەسێکی بڕواداره، بەڵام بەشێك یان زیاتر لە کوفر، یان دووڕوویی، یان نەفامیی تێدایە، فەرموودەکانیش وا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك تاوانی بە کوفر داناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانی لە خاوەنەکەی دانەڕنیوە.

کارکردن بەم بنەمایە ڕێگایەکە لە ڕێگەکانی چارەسەری ڕۆچوون و زێدەڕۆیی، ڕۆچووەکان وای بۆ دەچن یان دەبێت ئیمانی – صرف – تەواو، یان کوفری تەواو، تەنها کەوتنە نێو تاوانەوە بە کوفر دەژمێردرێت.

چاك دەرك پێکردنی و هەست پێکردنی ڕاستییەکانی ئیمان – حقیقة الایمان – و پەیوەندیی بە کردەوەکانەوە، لە زۆر دیاردە لە دیاردەکانی زێدەڕۆیی دەمانپارێزێت، گەر بەندەکان لە ئیمان تێبگەن کە بریتییە لە وتەو کردەوەو بڕوا بوون، کەم دەکات و زیاد دەکات، چەندین بەشی هەیە، پارێزراو دەبیت لە گومانەکانی – خوارج و معتزلە – و شوێن کەوتوانی کە دەڵێن ئیمان یەك حەقیقەتی هەیە، یان هەمووی دەڕوات و یان هەمووی دەمێنێت.

**چوارەم: بڕوابوون بەو دەقانەی مانای جۆراوجۆرو هەمەچەشن لە خۆ دەگرێت – المتشابه – کارکردن بە –المحکم– چەسپاوو ڕوون و ئاشکراکان.**

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی (هو الذی أنزل علیك الکتاب منه

[٤٤] رواه مسلم، بڕوانە صحیح مسلم ٢١٨ لاپەڕە ٨٨.

أيات محكمات هن أم الكتاب وأخر متشابهات فأما الذين فی قلوبهم زيغ فيتبعون ما تشابه منه ابتغاء الفتنة و ابتغاء تأويله وما يعلم تأويله الا الله والراسخون فی العلم يقولون أمنا به كل من عند ربنا وما يذكر الا أولوا ألالباب) أل عمران ٧.

ئەو خوایە زاتێكە كە قورئانی بۆ سەر تۆ (ئەی محمد ﷺ) ناردە خوارەوە، بەشێك لە ئایەتەكانی دامەزراوو پایەدارو ڕوون و ئاشكران، ئەوانە بنچینەو بناغەی قورئانەكەن و هەندێكی تریش واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی كە لە دڵیاندا لاریی و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستیی ناكەن، ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەكەون كە مانای جۆراوجۆرو فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنەو ئاشوب و ناكۆكی و دووبەرەكیی دروست بكەن، یان بۆ ئەوەی لێكدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێكدا كە لێكدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بە تەواوی دەیزانێت، جا ئەو كەسانەی كە لە زانستدا ڕۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بە هەر هەموو (ئەو ئایەتانە) هەیە كە لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە (لە ڕاستییدا) بێجگە لە خاوەن بیرو ژیرەكان، یا داوەریی وەرناگرن و بیرناكەنەوە (لەم قورئانە). (تەفسیری ئاسان)

لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی (إذا رأيتم الذين يتبعون ما تشابه منه، فأولئك الذين سمى الله فاحذروهم)[٤٥] ڕزگار بونیش لەم دەروازەیە كە بەدەروازەی لادان دادەنرێت بەدوو شت دێتە دی:

أ – كاركردن بە – محكم – دامەزراوو ڕوون و ئاشكراكان.

ب – بڕوابوون بە – متشابە – وانەی مانای جۆراوجۆر لەخۆدەگرێت.

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمویەتی (نزل الكتاب الأول من باب واحد، على حرف واحد، وأنزل القرأن من سبعة أبواب، على سبعة أحرف: زاجرا وأمرا، وحلالا

[٤٥] رواه البخاري ٤٥٤٧ لاپەڕە ١١٢٧ مسلم ٦٧١٧ لاپەڕە ١٢١١

وحراما، ومحكما ومتشابها وأمثالا، فأحلوا حلاله، و حرموا حرامه، وافعلوا ما أمرتم به، وانتهوا عما نهيتم عنه، واعتبروا بأمثاله، واعملوا بمحكمه، وأمنوا بمتشابهه وقولوا: أمنا به كل من عند ربنا)[٤٦]

شوێن كەوتنی – متشابە – هۆیەكە بۆ لادان و ڕۆچوون، وە بۆ خۆپاراستن و چارەسەر لە زێدەڕۆیی و داهێنان بڕوا بونە بە متشابە و كاركردنە بە –محكم– زانایانی دامەزراو پارێزراوبونە لە زێدەڕۆیی و دەرەنجامەكانی چونكە وتویانە (أمنا به كل من عند ربنا)

## پێنجەم / چارەسەری گەندەڵی عەقیدەیی:

ڕۆچون لە ئایندا گەندەڵیەكە لەبواری بیروباوەڕدا، ئەمەش پێویستی بە چارەسەرێكی بنەڕەتی و گشتگیرو میانڕەوانە هەیە بەپێی دەقەكانی شەریعەت.

ڕۆچون بواری خواپەرستی و سروتەكانی گرتۆتەوە، چەندین دیارەدەی شیرك – بە شێوازی جۆراوجۆرو بە بەڵگەو پاساوی جیا جیا لە ئارادایە و خەڵكانێك مەزاری پیاو چاكان و زانایانیان كردۆتە شوێنی پەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە و داوای ڕۆزی و شیفاو چارەسەری كێشەو پێداویستیەكانی لێ دەكەن و نەزریان بۆ دەكەن.

چارەسەری ئەمەش گەڕانەوەیە بۆ سەر عەقیدەی پاك و بێ گەردی ئیسلام كە خۆی لە عەقیدەی پێشینی ئەم ئومەتەدا دەبینێتەوەو میانگیرەو نە زێدەڕۆیی و نە كەمتەرخەمی و نە لادانی تێدایە.

دەبێت ئەوە بزانین هەر لادان و زێدەڕۆیی و كەمتەر خەمیەك لەلایەن هەركەس و دەستە و تاقمێكەوە كاردانەوە دروست دەكات و خەڵكانێكی تر بە ئاڕاستەی پێچەوانەی ئەوان هەنگاو دەنێن و ڕەفتار دەكەن بۆ نمونە. زێدەڕۆیی –

[٤٦] رواه الحاكم فی المستدرك وقال هذا حديث صحيح الأسناد (١ / ٥٥٣) و وافقه الذهبی. بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ٨٥٨

مورجیئـەكان لـەم سـەردەمەدا، كاردانـەوەی لای هەنـدێك دروسـت دەكـات كـە زێدەڕۆیی بنوێنن لە تەكفیر كردندا.

ڕۆچون و زێدەڕۆیی لای ڕێبازی سـۆفیەكان وای كـردووە هەنـدێك بـە ئاڕاسـتەی پێچەوانەدا زێدەڕۆیی بكەن، بۆیـە دەبیـنین كـاری هەڵـەو زێـدەڕۆیی كاردانـەوەی هەڵە و زێدەڕۆیی لێ كەوتۆتەوە، چارەسەری هەموو ئەمانەش گەڕانەوەیە بۆ سەر ئەو عەقیدەو بیرو باوەڕەی كە پێشینی ئەم نەتەوەیەی لەسەر بووە.

**شەشەم / پاراستنی ئاین لە گاڵتەجاڕەكان**

لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەكاندا دەركەوتوە كە یـەكێك لـە هۆكارەكـانی زێـدەڕۆیی گاڵتە كردنە بە ئاین، دژایەتی و گاڵتەجاڕی بە ئاین كاردەكاتە سەر دڵ و دەروون و هەستونەستی كەسانێكی بەغیرەت ئەو كەسانەش، بۆ گۆڕینی ئەو كارانە پەنا دەبەنە بەر هۆكاری نا شەرعی.

بۆ ڕێگرتن لە دژایەتی و گاڵتە جاڕی بە بەها پیرۆزەكانی ئـاین، پێویـستە ڕێ و شوێنی گونجاوو دروست بگیرێتە بەر، تا كەسانێكی نەفام و بێ باوەڕو نە شارەزا دژایەتی بە ئاین نەكەن و بواریان نەدرێتێ لە ژێر نـاوی ئـازادی ڕادەربڕینـدا ڕق و كینەی خۆیان بە ئیسلام و موسڵمانان و قورئان و فەرمودەو كەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بڕێژن و سوكایەتی بە موسڵمانان بكەن و مافەكانیان پێشێل بكەن.

دەبێت دەوڵەت و دەزگا پەیوەندی دارەكـان ڕێـز لـە بـەها پیرۆزەكـانی ئیـسلام بگرێت وبوار نەدات بەهیچ نوسراوو بڵاوكراوەیەك كە دژایەتی دەقەكانی ئاین بكات چونكە دژایەتی دەقەكانی شەریعەت تاوان و زێدەڕۆییە، گەر بوار بە كەسـانێك بدرێت بە ئارەزووی خۆیان دژایەتی ئاین و بەها پیرۆزەكانی كۆمەڵگا بكـەن ئـەو كات كاردانەوە دروست دەبێت، زۆر جار كاردانەوەكانیش هەڵەو پەڵەن و زێدەڕۆن و توندوتیژی لێ دێتە بەرهەم. چونكە كەسانێك ئەو كاردانەوەیان لێ دەوەشێتەوە

سۆزو عاتیفەی ئاینیان هەیە بەلاَم شارەزاو زانا نین بە دەقە شەرعیەکان و چۆنیەتی گۆڕینی خراپەو لادان و زێدەڕۆیی بەرامبەر.

جا دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین چارەسەری دروست ئەوەیە، کە چارەی هەردوو دیاردە خراپەکە بکات کە بریتین لە گاڵتەکردن بە ئاین و رۆچوون و زێدەڕۆیی لە ئایندا.

**باسی سێیەم: چارەسەری زانستیی بۆ کێشەی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی**

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی دیاردەی رۆچوون و زێدەڕۆیی لە ئاییندا نەفامیی و نەزانیی و لاوازیی ئاستی زانستە شەرعییەکانە.. بایەخدان بەلایەنی زانستە شەرعییەکان لە هەموو ڕوویەکەوە ئەم دیاردەیە سنووردار دەکات و چارەسەرێکی گونجاوی ئەم کێشە ترسناکەیە.. بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی زانستی وەك چارەسەرو خۆپارێزی، باسەکەمان لە چەند بڕگەیەکی سەرەکییدا ڕوون دەکەینەوە.

یەکەم: خواستن و فێربوونی زانستە شەرعییەکان.

نەفامیی بنچینەیەکە لە بنچینەکانی لادان، خوای گەورەش داوای فێربوون و خواستنی زانست و زانیاریی لێ کردوین، چونکە کارو کردەوە دەبێت لەسەر بنەمای زانست و زانیاریی ئەنجام بدرێت. ئەوەتا خوای گەورە فەرموویەتی (فاسألوا أهل الذکر ان کنتم لا تعلمون) النحل ٤٣، الانبیاء ٧

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (من یرد الله به خیرا یفقهه فی الدین)،[٤٧] هەروەها فەرموویەتی (طلب العلم فریضة علی کل مسلم) [٤٨]

[٤٧] رواه البخاري٣١١٦ /٣ وه ٧٣١٢/ ٢ لاپەڕە ٧٩٨وە ١٧٧٠ و مسلم٢٣٨٦ وە ٢٣٨٩ وە ٤٩٣٣ لاپەڕە ٤٦١ و ٩٠٩

[٤٨] أخرجه ابن ماجه فی سننه و صححه الالبانی. بڕوانە مشکلة الغلوا في الدین لاپەڕە٩٠٣

زانایـانی پایـە بـەرزیش لـە ووتـە بەنرخەكانیانـدا باسـی ڕێـزو پـیرۆزی زانـست و بایەخـدان بـەم بـوارە گرنگـە دەدەن ئـەوەتا ابـن مـسعود خـوای لیٚ ڕازی بێـت فەرمویەتی (اغد عالم أو متعلما، ولا تغد إمعة بين ذلك).[٤٩]

ئیمامی ئیبن قەییم ڕەحمەتی خوای لێبێت وتوویەتی (إن العبد لو عرف كل شيء، ولم يعرف ربه، فكأنه لم يعرف شيئا)[٥٠].

بەندەكان گەر هەموو شت بزانن، بەلاٚم خوای گەورە نەناسن وەك ئەوەیە هیچیان نەزانیبێت. مەبەستیش لە زانـست و زانیـاریی زانیارییـە شـەرعییەكانی قورئـان و فەرمودەیـە، ئەمـەش دەبێـت لـە كەسـانی ئـەو بـوارە وەربگیرێـت كـە زانایـانی ئیـسلامە. هـەروەها كـۆلێج و پـەیمانگاو قوتابخانـە شـەرعییەكان دەبێـت بـە خۆداچـونەوەی تێـدابكرێت و بەرنامـەی پـەروەردەو زانـستیان تۆكمـەو داڕێـژراو بكرێت، تا بتوانن ڕۆڵی كاریگەرییان ببێـت لـە بلاٚوبوونـەوەی زانـست و زانیـاریی شەرعییدا.

## باسی چوارەم: چارەسەری كێشەی ڕۆچوون بە دیدێكی هاوچەرخانە

لەم سەروبەندەدا چەندین شێوازی جۆراوجـۆر لـە ولاٚتانـدا گیراوەتـە بەربـەنیازی چارەسەری كێشەی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی هەر دەستەو لایەنێك لـە میانـەی دیـدو بۆچوونێكەوە باس لە چارەسەرو بنبڕكردنی دەكات. ئێمەش هـەوڵ دەدەیـن بـە كورتی خوێندنەوەیەكی خێرا بكەین بـە نـاو گـرنگترین ئـەو شـێوازانەداو هـەڵیان بسەنگێنین و بزانین تا چەند لە خزمەت پرۆسەكەدایە:

---

[٤٩] رواه ابن عبد البر جامع بيان العلم و فضله (١ / ٢٩). بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ٩٠٤

[٥٠] إغاثة اللهفان ١ / ٦٨ بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ٩٠٤

## بەندی یەكەم: پەیڕەوو بەرنامەی زانایانی ئیسلامیی هاوچەرخ بۆ چارەسەری كێشەی ڕۆچون

زانایان لە ئیسلامدا پلەو پایەو ڕێزو شكۆداریی خۆیان هەیەو ئەرك و كاری گرنگی هەستیاریان لەسەر شانەو دەبێت جێبەجێی بكەن ئەویش ڕوونكردنەوەو بەیانكردنی پەیام و بەرنامەی خودایە بەپێی دەقەكان، خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرمویەتی (وإذ أخذ الله ميثاق الذين أوتوا الكتاب لتبيننه للناس ولا تكتمونه) آل عمران ١٨٧. كاتێك خوا پەیمانی وەرگرت لەوانەی كتێبیان پێ بەخشراوە كە ڕوونی بكەنەوە بۆ خەڵكیی و مەرامەكانی باس بكەن و نەیشارنەوە.(تەفسیری ئاسان)

ئەم ڕوونكردنەوەیەش سێ خاڵی سەرەكی لە خۆدەگرێت:

١- ڕوون كردنەوەی بنەڕەتی

ئەمەش بەخستنەڕووی حەق و ڕاستییەكانی ئیسلام و فێركردنی خەڵكیی بە سوننەتەكان، ڕێنوێنی كردنیان بە ڕاستە شەقامی ئیسلام.

٢- ڕوونكردنەوە بە مەبەستی بەهێزكردن و بەرگەگرتن

هوشیاركردنەوەو ئاگاداركردنەوەیان، لە هەر لادان و گومڕایی و سەرلێشێواوییەك و وەلآمدانەوەی هەر گومانێك لە ئارادابێت.

٣- ڕوونكردنەوە بە مەبەستی چارەسەركردن

ئەمەش بە چارەسەركردنی ئەو كەسانەی كەوتونەتە نێو بازنەی زێدەڕۆیی و ڕۆچوونەوە، چۆنیەتی ڕزگار بونیان لەو لادان و سەرلێشێواوییە.[٥١]

زانایانیش بە فێركردن و ڕێنوێنیكردن خەڵكیی هوشیار دەكەنەوە، بە تایبەت توێژی لاوان، كە زیاتر لە كەسانی تری نێو كۆمەڵگە لادان و زێدەڕۆیی، یان

---

[٥١] بڕوانە مشكلة الغلو في الدين لاپەڕە ١٠١٩.

كەمتەرخــەمیی و فەرامۆشــكردن دەیانگرێتــەوە، بــەهۆی كــەم ئــەزموونی و نەشارەزاییەوە..كە باسی ڕۆڵی زانایان دەكەین مەبەستمان لە زانا ئەوانەن كە بە ڕاستیی و دروستی زانان و چەمكی زانایی دەیانگرێتەوە نەك بە ڕووكەش و جل و بەرگ، لە نێو موسڵمانانیشدا پلەو پایەو كەسایەتی خۆیان هەیە.

ئەمەو زانایانی ئیسلامیی لە میانەی وانەو وتارو فەتواو كۆڕو نووسراوەكانیانەوە دەتوانن ڕۆڵی كارا بگێڕن بۆ چارەسەری ئەم دیاردانە.

لێـرەدا بـە پێویـستی دەزانـین بـاس لـە رۆڵـی زانایـانی ئیـسلامیی و بـانگخوازانی میانڕەو و حیزب و لایەن و دەزگا ئیسلامییە میانڕەوەكان بكـەین، كـە دەتـوانن رۆڵی بەرچاوو گرنگ ببینن بۆ رووبەڕووبوونەوەو چارەسەركردنی كێشەی رۆچوون بە شێوازێكی زانستیانەو بابەتیانـە، چارەسـەرێك لـە ڕەگ و ریـشەوە بێـت نـەك رووكـەش و سـادە، كـە خـۆی لـە ئیدانـەكردن و جنێـودان و سـووكایەتییكردندا دەبینێتەوەو چارەسەری رەوشەكە ناكات. ئەمڕۆ كێـشەی رۆچـوون لـە هەنـدێك شوێن و وڵاتدا ئاڵۆز بووەو هۆكارەكەشی ئەوەیە زانایان و بـانگخوازانی میـانڕەو پەراوێز خراون لە پرۆسەی چارەسەركردندا، بە پێچەوانەوە كەسانێك كـە پابەنـد نین بە ئایین و نەشارەزان لە زانستی شەرعیی قسە لەسەر ئەم بابەتە دەكەن لە بری چارەسەر زۆرجار دۆخەكە ئاڵۆزتر دەكەن و خزمەت بە رۆچووەكان دەكەن بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ. كێشەی رۆچوون لە ئاییندا لادانـە لـە میانـەیی ئـایین و دەقـە شـەرعییەكانی و چارەسـەریش دەبێـت لـە میانـەی دەقـەكانی قورئـان و فـەرموودەوە بێــت، هــەر چارەســەرێك بــەدەر لــە قورئــان و فــەرموودە، یــان چارەسەرێكی كاتییە، یان چارەسەر نییە و كێشەكان ئاڵۆزتر دەكات و خەڵكانی تریش دەچنە نێو بازنەكەیانەوە.[52]

[52] بڕوانە جذور الغلوا ٤٣–٤٥

## بەندی دووەم: چارەسەری یاسایی و ئاسایشی

باوترین شێواز كە وڵاتان پەنایان بۆ بردووە بۆ چارەسەری كێشەی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی چارەسەری ئاسایش و یاساییە. چارەسەری ئەمنیی پێویستییەكە لە پێویستییەكانی چارەسەری ئەو كێشانەی كە ئارامی وڵات و هاووڵاتیان دەخاتە مەترسیەوە، بەڵام گەر لەم شێوە چارەسەرە بڕوانین دەبینین ڕەخنەو كەم و كورتی زۆری ئاڕاستە دەكرێت لە وڵاتە ئیسلامییەكاندا، ئەویش گرتن و ڕاونانی ڕەشبگیرانە و ئەشكەنجە و ئازارو مانەوەیەكی زۆر لە بەندیخانەو بێسەرو شوێن كردنی گیراوو چەندین ڕەفتاری تر كە بە پێوەری شەرعیی و یاسایی ناڕەوایە. یان بە ناوی دژایەتی تیرۆرو زێدەڕۆییەوە خەڵكانێك دەگیرێن، چونكە سیمای دیاری ئیسلامیان هەیە وەك ڕیش و جل و بەرگ. بەم كارو ڕەفتارانە چارەسەری كێشەی توندوتیژیی ناكرێت و ئامانج و مەبەستەكانی نایەتە دی، بەڵكو كێشەكان ئاڵۆزتر دەبن، زێدەڕۆیی و ڕق و كینە و شەڕو ئاڵۆزیی زیاتر دەبێت. بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم باسەمان چەند تێبینیەك دەخەینە ڕوو سەبارەت بە چارەسەری كێشەی ڕۆچوون و توندوتیژیی بە شێوازی ئەمنیی:

أ – چارەسەركردنی ئەمنی بە تەنها هەڵەیەكی ئاشكرایە، چونكە كێشەی ڕۆچوون كێشەیەكی فرە لایەن و ڕەهەندە، كێشەیەكە لایەنی شەرعیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوریی و فەرهەنگیی و... هتد دەگرێتە خۆ، جا گەر كێشەیەك ئەوەندە لایەنی هەبێت، چارەسەرەكەشی دەبێت ئاوڕ لە هەموو ئەو خاڵانە بداتەوە. چونكە چارەسەر لقێكە لە هۆكارەكان و بریتییە لە لابردنی هۆكارەكان. جا لەبەر ئەوەی هۆكارەكان فرەن پێویست دەكات چارەسەرەكانیش فرە لایەن بن.

چارەسەری ئەمنیی بە تەنها هەرچەند سەركەوتنی كاتیی بەدەست بهێنێت، دیاردەیەكی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی سنووردار بكات و مۆڵی بدات، بەڵام ناتوانێت چارەسەری ڕیشەیی بكات، چونكە ڕەگ و ڕیشەی ڕۆچوون وەك بیرۆكەو بڕوایەكە لە ناخ و دەرووندایە، دەبێت ئەو لادانە بە زانست و بەڵگەی شەرعیی پوچ كرێتەوە، چارەسەری ڕیشەیی بۆ ئەو كێشەو لادانە و هۆكاری دروست بونیان دانرێت. لەبەر گرنگیی ئەم مەسەلەیە چەندین پسپۆڕو توێژەرەوەو شارەزا ڕاو بۆچوونی خۆیان خستۆتە ڕوو لە دەرەنجامی ئەزمونی كەسێتیی و واقیعی حاڵدا خاڵی جوان و بە سودیان خستۆتە ڕوو بە چاكی دەزانین ئاماژە بە چەند وتەیەكی ئەو كەسانە بكەین.

د. سعدالدين ابراهيم سەبارەت بە چارەسەركردنی خراپی ڕۆچوون دەڵێت (ليس بالردع وحده يتم القضاء على التطرف... ان العقاب الصارم والردع الحاسم، مطلوبان فى مواجهة أعمال الارهاب، لا يختلف حول ذلك عاقل، ولكن الخطأ كل الخطأ أن يعتقد أي عاقل، أنه بالردع و بالاجراءات الامنية وحدها، يتم القضاء على التطرف).[٥٣]

ب – بەتەنها بەكارهێنانی چارەسەری ئەمنیی بۆ دژایەتیكردنی ڕۆچوون، ڕق و كینە و دژایەتیی قووڵ دەكاتەوە لە نێو كۆمەڵگادا، بەڵام گەر هەموو جۆرەكانی تری چارەسەر بگیرێتە بەرو ئەمیش یەكێك بێت لەو هۆكارانە ئەوا ئەو كات چارەسەرەكان شوێنی خۆیان دەگرن و دەبنە مایەی ڕەزامەندی كۆمەڵگا.

بۆ ئەم مەبەستە لیوا حسن ابو باشا وەزیری ناوخۆی پێشووی میسر دەڵێت (بحكم ممارستي الطويلة و خبرتي السياسية أقول: إنه عندما يرجع الامن لأسلوب العقاب الجماعى والقتل، فأن ذلك يضر بقضايا الأمن اكبر ضرر يمكن أن يحدث، و

[٥٣] كتاب مصر تراجع نفسها ١٦ ، بڕوانە مشكلة الغلوا في الدين لاپەڕە ١٠٥٥

یعمق روح السخط العام بین هذه المجموعات، ویؤصل فی نفوسها روح العداء والغل داخله)[٥٤]

لێكۆڵینەوەكان ئەوەیان دەرخستووە بە تایبەتی لە وڵاتانی دراوسێماندا كە پیاوانی دەزگا ئەمنییەكان زیاتر بونەتە ئامانجی كارە تیرۆریستییەكان لە هەموو چین و توێژێكی تری كۆمەڵایەتیی تر زیاتر ڕق و كینەی لە نێواندا دروست كردووە.

ج – چارەسەری ئەمنیی زۆرجار دوای ڕوودانی كارەسات و شەڕو ئاژاوە ئەنجام دەدرێت كاتێك كە ڕۆچوونەكە دەبێتە كارێكی مادی نەخواستراو وەك كوشتن و تەقینەوەو... هتد، بەڵام چاك ئەوەیە پێش ڕوودانی كارەسات ئەو بیرۆكەیە چارەسەری بۆ دابنرێت كە دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەو جۆرە كردەوانە. بەڵام دانانی چارەسەری خۆپارێزیی بۆ كێشەی ڕۆچوون پێش ڕودانی هەر كارێكی نائاسایی، كارێكی پێویستە ئەویش بە بڵاوكردنەوەی ڕەوت و پەیڕەوی میانڕەوانەی ئیسلام دەبێت و ناكرێت ئەم لایەنە پشتگوێ بخرێت یان بە پێی پێویست كاری لەسەر نەكرێت.

د – ئەو كەسانەی كە دەزگا ئەمنییەكان دەیانگرن زۆرجار ڕەچاوی مافەكانی مرۆڤ ناكەن و ئەو كەسانە لە گرتووخانەی تایبەت و لە دەزگای تایبەت لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ دەكرێت و مافی بەرگریكردن لە خۆو دانانی پارێزەریان نادرێتێ و زۆر جار دادگای تایبەت و نائاسایی لەلایەن دەوڵەتەوە دانراوە بۆ ئەم جۆرە كێشانە، دادگاكانیش ڕووكەشین بە پێی دەقەكانی شەریعەت و یاساش تاوانبار مافی هەیەو دەبێت مامەڵە كردن لەگەڵیدا پێچەوانەی شەریعەت و یاسا نەبێت و هەڵەو تاوان بە هەڵە و تاوان چارەسەر نەكرێت، دەبێت كار بەو بنەمایە

[٥٤] نقلا عن محمد الطویل (الأرهاب) ٥٩ بڕوانە: مشكلة الغلوا في الدین، لاپەڕە ١٠٥٦

بكرێت كە دەقەكانی شەریعەت و یاساش بە بنەمایەكی گرنگ و پێویستیی دادەنێت كە دەڵێت (المتهم برئ حتى تثبت إدانته)

هـ – توندیی و ڕەقیی لە چارەسەركردندا: بەكارهێنانی هێز بۆ چارەسەركردن دەبێت بە پێی ئەو ڕێژەیە بێت كە بارودۆخ و كێشەكە پێویستێتی، هەر جۆرە زێدەڕۆیی و ڕۆچوونێك لە بەكارهێنانی هێزدا دەرەنجامی خراپی لێ دەوەشێتەوەو بە زیانی كۆمەڵگاو ئارامیی وڵات كۆتایی دێت.

و– گشتاندن: گشتاندن لە سزاداندا پێچەوانەیە بە دەقەكانی شەریعەت و یاسا،[55]
خوای گەورە فەرمویەتی (كل نفس بما كسبت رهينة) المدثر ٣٨
هەموو كەس بارمتەی دەسپێشكەری خۆیەتی (كردەوەكانی دێتەوە ڕێی)
(أ لاتزر وازرة وزر أخرى) الانعام ١٦٤، الاسراء ١٥، فاطر ١٨، الزمر ٧ .
هیچ گوناهبارێك گوناهی كەسانی تر هەڵناگرێت.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی (لا يؤخذ الرجل بجريرة أبيه ولا بجريرة أخيه)[56]
بۆیە زۆر جار دەبینرێت دەزگا ئەمنییەكان لەگەڵ گرتنی تاوانبارێكدا باوك و دایك یان خوشك و براو خێزانی ئەو كەسانە دەگرێن، ماوەیەكی زۆر لە بەندیخانەدا دەمێننەوە، هیچ تاوانێكیان نییە جگە لەوەی كوڕێكیان، كەسێكیان، كارێكی نایاسایی یان تاوانێكی ئەنجام داوە، یان بەو كارانە تۆمەت باركراوە. بێگومان ئەم جۆرە ڕەفتارانەی دەزگا ئەمنییەكان بە شێوەیەكی نەگەتیڤانە كار دەكاتە سەر كۆمەڵگاو كێشەكان قووڵتر دەكاتەوە.

جارێكی تر جەخت لە سەر ئەوە دەكەینەوە كە بەكارهێنانی هێزو توندوتیژیی بە تەنها چارەسەری كێشەی ڕۆچوون ناكات. بە پێی ئەزموون چارەسەری ڕۆچوون

[55] بڕوانە: مشكلة الغلو في الدين، لاپەڕە ١٠٥٧–١٠٥٨.
[56] رواه النسائی كتاب تحريم الدم باب تحريم القتل بڕوانە سنن النسائی، لاپەڕە ٩٨٣.

بە توندوتیژیی بێسود بووەو بۆتە هۆی سەرهەڵدانی رەوت و ئاراستەی تری رۆچوون، ناكرێت زمانی گفتوگۆ و وتوێژی زانستییانەو بابەتییانە بە پێی پلانێكی دروستی پێشوادە فەرامۆش بكرێت، مێژووی ئیسلام شاهیدی ئەو حاڵەتەیە، ئەوەتا ئیبن عەباس (خوایان لێ رازیبێت) كاتێك گفتۆگۆ دەكات لەگەڵ خەواریجەكاندا دوو هەزار كەس، یان زیاتریان لێ پەشیمان دەبێتەوە و دێنەوە سەر هێڵی میانەیی ئیسلام. شێوازی گفتوگۆ بۆ چارەسەری ئەم جۆرە كێشانە زۆر بە سوودە لە بەر ئەوەی روونـاكی حەق درەوشاوەیەو بەڵگەكانی كاریگەرو یەكلاكەرەوەیە، گفتوگۆش چارەسەری كێشەكە دەكات لە رەگ و ریشەوە، لە بەرئەوەی رۆچوون و توندی سیماو رەنگدانەوەی بیرۆكەیەكە، ناكرێت بیرۆكەیەك بە شێوەیەكی رووكەشانە لابەرین، بەڵكو دەبێت چارەسەری ریشەیی بۆ بدۆزینەوە.[٥٧]

## بەندی سێیەم: ڕۆڵی كەناڵەكانی ڕاگەیاندن لە چارەسەری كێشەی رۆچوون و زێدەڕۆیی دا

میدیاكان لەم ڕۆژگارەدا كاریگەرێتییەكی بێئەندازەیان هەیە لەسەر دەروون و بیروڕاو هەست و نەست و هەڵوێستی خەڵكییدا. لە ڕاستییدا یەكێك لە پەیامەكانی ڕاگەیاندن بریتییە لەوەی خەڵكیی ئاگادار بكاتەوە لە هەواڵی ڕاست و دروست و زانیاریی پێویست و ڕاست و سەلمێنراو. تا هاوكارییان بكات لە پێكهێنانی دیدوبۆچوون و ڕایەكی دروستدا سەبارەت بە ڕووداوێك یان كێشەیەكی دیاری كراودا. ڕاست وایە كە ڕاگەیاندن ڕاستییەكان وەك خۆی بگەیەنێت، بەڵام مایەی نیگەرانییە ڕاگەیاندن زۆرێك لە ئەرك و فەرمانەكانی خۆی لە دەست داوە، زیاتر

[٥٧] بڕوانە: جذور الغلوا لاپەڕە ٤٣- ٤٤.

پڕوپاگەندە بۆ کەسێك یان لایەن و ڕەوت و ڕێچکەیەك دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات و هێرش دەکاتە سەر لایەنەکانی تر. تا ئەو ئاستەی وشەی ڕاگەیاندن هاوشانی وشەی پڕوپاگەندە بگرێتەوە لە ڕووی کردارو ئاکارەوە. ئەمەش بەهۆی ئەو لادان و شێواندنانەی کەوتۆتە نێو دەزگاکانی ڕاگەیاندن. دەبینین هەواڵەکان وا دادەڕێژرێت و هەڵدەبژێرێت تا کار بکاتە سەر جەماوەر بەو ئاڕاستەیەی کە بۆی دیاری کراوە، نەك بابەتیی و بێلایەنیی و ڕاستیی و دروسێتی هەواڵەکە، یان زۆر هەواڵ و ڕووداوی گرنگ هەیە فەرامۆش دەکرێت یان لە گۆشەیەکی بچووکدا ئاماژەی پێدەکرێت بە شێوێنراوی. ئەمەو ڕاگەیاندن لەم سەردەمەدا بوارو چالاکییەکانی زۆر فراوانەو لە بواری ڕۆشنبیریی و ڕێنوێنی و وەرزش و تەنانەت وەك ئامرازێك بەکار دەهێنرێت لە ململانێی ڕۆشنبیریی و سیاسیی و سەربازیدا، ڕاگەیاندن دەتوانێت ڕۆڵی کارای هەبێت لە چارەسەرکردنی کێشەکانی نێو کۆمەڵگا لە میانەی وتارو چاوپێکەوتن و کۆڕو سیمینارو.. هتد. گەر بێت و ئەم ئامرازە بەلایەنە چاکەکەی بەکار بهێنرێت، چونکە ڕاگەیاندن وەك دەوترێت (سلاح ذو حدين)ە. کەناڵەکانی ڕاگەیاندن وەك ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕادیۆو تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و... هتد. هەر کەناڵەو لە بواری خۆیداو بەپێی تایبەتمەندیەتی خۆی دەتوانێت ڕۆڵی بەرچاو ببینێت بە ئاڕاستەی پۆزەتیڤانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زێدەڕۆیی و ڕۆچوون، بە شێوازێکی زانستییانەو بابەتییانە...

بەڵام ئەوەی دەبینین و لە بەردەستدایە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن نەیانتوانیوە ئەرکی پێویستی سەرشانیان جێبەجێ بکەن لەبەر ئەوەی ئەم کەناڵانە هەریەکەیان موڵکی لایەنێك، یان ناوەندێك یان حزب و دەسەڵاتێکن خزمەتی خاوەنەکەی دەکات و بە حەق و ناحەق شایەدی بۆ دەدات و پەیامەکەی خۆی لە دەست داوە، ڕاگەیاندنی بێلایەنیش بە مانا تەواو دروستەکەی لە ریزی نەبووندایە، بۆیە

دەبینین ڕاگەیاندنەکان ئەوەندەی بواریان بۆ کەسانێك ڕەخساندووە کە دژایەتیی بەها پیرۆزەکانی ئیسلام بکەن و تانەو تەشەرو پیلان دژ بە رەوتی ئیسلامیی بگێڕن، راستییەکان بشێوێنن و کەم و کوڕی ئیسلامییەکان فوپیا بکەن و و گاڵتەجاڕی بە سیماو دیاردە ئیسلامیەکان بکەن، زۆر بەدەگمەن بواریان بە کەسانێك داوە لەو کەناڵانەوە باسی پەیامی ئیسلام بۆ جەماوەر بکات و هۆشیاریان بکاتەوە. یان بە پاساوی دژایەتی رۆچوون دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان و دەقە پیرۆزەکان دەکرێت و جەماوەر چەواشە دەکرێت و ڕاستییەکانی لێ دەشاردرێتەوە.

## بەندی چوارەم: چارەسەرکردنی کێشەی رۆچوون بە پێی بەرنامەو رێبازی رۆژئاواییەکان

زاراوەی ڕۆژئاوا بۆتە ناوێك بۆ شارستانیی ئەوروپاو ئەمەریکای هاوچەرخ کە لە چەند پێکهاتەیەك دروست بووە، لەوانە: فەلسەفەی یۆنانیی، یاسای ڕۆمانیی فەلسەفەی دانراوی هاوچەرخ. دیدو بۆچوونی ڕۆژئاوا لەم بارەوە چون یەك نین. کۆمەڵگای ئەوروپیی بە درێژایی مێژووی ئیسلام هاوسنوورو بووە جۆرێك لە پەیوەندیی هەبووە و سەرەڕای ململانێ و شەڕو پێکدادان. ڕۆژئاواییەکان ئیسلامیان لە بەرچاو ناشرین کرابوو، گیانی ڕقەبەرایەتی لە ناخیاندا هەبووە بەرامبەر بە ئیسلام، چەند هۆکارێکیش ڕۆڵی هەبووە لە دروست بوون و پەرەسەندنی ئەم نەیاری و دوژمنایەتییە:

١- ململانێی مێژوویی نێوان ئیسلام و نەصرانییەت (خاچپەرستەکان) کە سەرەتاکەی فتوحاتی ئیسلامیی بوو لە قۆناغە بەراییەکانی ئیسلامداو، فەتحی ئەندەلووس و قوستەنتینیەو شەڕی خاچپەرستەکان و ڕووبەڕووبوونەوەکان لەگەڵ

دەوڵەتی عوسمانییداو سیاسەتی ئیمپریالیستی ڕۆژئاوا بەرامبەر جیهانی ئیسلامیی بە تایبەت لە سەدەی نۆزدەو بیستدا. ئەم هەموو کێشەو ململانێیانە ڕۆڵیان هەبووە لە پێکهێنانی عەقڵیەتی تاکی ڕۆژئاوا لە هەڵوێستیاندا بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان.

٢- پێشنیازی ڕۆژهەڵاتناسەکان، کتێب و نووسراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر بیروباوەڕو شەریعەتی ئیسلامیی و شارستانی و ڕۆشنبیری ئیسلامیی، مێژوو، سیستەمی ئیسلامی هەمووی دەچێتە خانەی ناشرین کردنی ئیسلام و موسڵمانان و بەشێك لە ململانێی نێوان ئیسلام و خاچپەرستەکان..

ئەمەو لە میانەی نووسینەکانیاندا ڕاستییەکانیان ئاوەژوو کردۆتەوە و هەوڵیان داوە موسڵمانانیش گومڕاو سەر لێ شێواو بکەن و لە ئاینەکەیان دووری بخەنەوە.

٣- ئەو کارە توندوتیژییانەی لەم ساڵانەی دواییدا لە چەندین شوێنی جیهان بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاواییەکان ڕووی داوە بە ناوبانگترین ڕووداو، کارەساتی تەقینەوەی مەڵبەندی بازرگانیی جیهانیی بوو لە نیویۆرك. ئەم کارەسات و ڕووداوە تیرۆریستییانە کاری کردۆتە سەر دیدو بۆچوون و هەڵوێستی تاکی ڕۆژئاوایی و هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان.

٤- ڕاگەیاندن: ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا کە زیاتر جوولەکە تێیدا باڵادەستە بە هەموو شێوازێك هەوڵی داوە وێنەی ناشرین سەبارەت بە ئیسلام بخاتە ڕوو، تا کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی چەواشە بکەن و لە ڕاستییەکانی ئیسلام نەگەن. بە دەیان و بگرە بەسەدان کتێب و بەرنامەی تەلەفزیۆن و سەدان فیلمی سینەمایی و وێنەی کاریکاتێریی و وتارو بەرهەمی ئەدەبیی و هونەریی هەموو بەکارهاتوون بۆ دژایەتیی و ناشرینکردنی وێنەی ئیسلام و موسڵمانان لە بەر چاوی دانیشتواندا.

٥- بەرنامەی خوێندن لە ڕۆژئاوادا: ئەو کتێب و بابەتانەی لە ڕۆژئاوادا دەخوێندرێن و باس لە ئیسلام و موسڵمانان دەکات لە قۆناغی دواناوەندی قوتابخانەکاندا، لەلایەن کەسانێکەوە نووسراون کە دژو نەیارن بە ئیسلام و موسڵمانان.

٦- ڕەوتی توندڕەویی گاورەکان: ئەم ڕەوتە جموجوڵ و ڕۆڵی دیاریکراوی هەیە و تواناو ئامرازی زۆریان لەبەر دەستدایە بە چەندین شێوازی جۆراو جۆر کار دەکەن، بە تایبەت لە ئەمەریکاداو پەیوەندییان توندو بەهێزە بە ئیسرائیلەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ ناشرین کردن و شێواندنی بەرنامەی ئیسلام و خەڵکەکەی.

ئەمڕۆ لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا دەیان دەزگاو ناوەندو کەناڵی جۆراوجۆر هەیە بە مەبەستی دیراسەکردنی ئیسلام و موسڵمانان و ڕەوتە ئیسلامییەکان بە گشتیی و ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکانیاندا کە زیاتر ئاماژەی پیّ دەکەن و ناویان لێناوە ئسولّییەتی ئیسلامیی و زاراوەی ئسولّییەتیانیشیان بەپێی نیازو مەبەستەکانی خۆیان لێکداوەتەوە، ئەو ناوەندانە کەسانی پسپۆڕو شارەزا کاری تێدا دەکەن، بەردەوام لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر دەخەنە ڕوو. بەڵام گەر توێژینەوەیەکی وردی باس و پێشنیازو گفتوگۆکانیان بکەین و بابەتییانە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام بدەین، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەم باسانە بێلایەن نین، هەرچەندە هەندێکیان تا ڕادەیەك بابەتیی پێوە دیارە، یان ئیدعای بێلایەنیی دەکەن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی ناتوانرێت بکرێنە پێوەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زێدەڕۆیی لە ئاییندا، بە تایبەت کە باسەکەمان زێدەڕۆییە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، ئەو کەسانە ناتوانن دڵسۆزو بێلایەن بن، چونکە هەر لە سەرەتاوە ئەو کەسانە هەڵوێستی خۆیان لە ئیسلام وەك ئایین و بیروباوەڕ ئاشکرایە و ناتوانێت میانڕەو

بێت و چارەسەر بۆ كێشەكان بەشێوازی زانستیانە و بابەتییانە بدۆزرێتەوە. بۆیە چارەسەركردنیان زۆر جار ڕووكەشە، یان زۆر جار كێشەكانی جیهانی ئیسلامیی بە هۆی سیاسەتی پاوانخوازی ڕۆژئاوا زیاتر قوولّ بۆتەوە، وەك ئەوەی یارمەتیی و هاوكاریی تەواوی لایەنە چەپ و ڕادیكاڵەكان و عەلمانییەكان دەدەن و بەهێزیان دەكەن دژ بە ڕەوتی ئیسلامیی بە گشتیی و تەنانەت دژ بە یاساو دەقە پیرۆزەكانیش. كە ئەمەش كێشەو قەیرانەكان زیاتر قوولّ دەكاتەوە، بە زیانی گەورەی كۆمەڵگا تەواو دەبێت، ئەم باسەش دوورو درێژەو زۆری دەوێت بوارنییە تا زیاتر لە سەری بڕۆین.[58]

**بەندی پێنجەم: ڕێبازو ڕەوتی لایەنە عەلمانییەكان بۆ چارەسەری كێشەی رۆچوون**

ڕەوتی عەلمانیی لە جیهانی ئیسلامییدا بە گشتیی خۆی لە چەندین ڕەوت و بۆچوونی سیاسیی جیاجیا دەبینێتەوە لە ڕاستەوە بۆ چەپ.

پێشنیازی عەلمانییەكان بۆ هەڵوەشاندنەوەی بنەما ئیسلامییەكان:

١- ڕەخنە لە هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی كە شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموو قۆناغ و سەردەمێك دەشێت. باسكردنی ئەوەی دەقەكان بە پێی كات و شوێن دەگۆڕێن هیچ جێگیر نییە.

٢- هەوڵدان بۆ جیاكردنەوە، لە نێوان ئیسلام و جێبەجێ كردنی شەریعەتی ئیسلام.

٣- باسكردنی ئەوەی جیاكردنەوەی ئایین لە دەوڵەت مانای دژایەتی ئاین ناگەیەنێت. ئایین پەیوەندیی نێوان بەندەكان و خوایە و كاری بەسەر دەوڵەتەوە

[58] بڕوانە: مشكلة الغلو في الدين، لاپەڕە ١٠٨٧-١١٣٣.

نییـە، دەوڵـەتیش كـاری بەرهـەمهێنان و بـەهای فیكریـی و بـەڕێوەبردنی وڵات و...هتدە..

بوار ڕەخـساندن بـۆ دژایـەتی ڕۆچـوون و زێـدەڕۆیی لـە كەناڵـەكانی ڕاگەیاندنـدا، عەلمانییەكان بانگەشە بۆ ئەوە دەكـەن و كـاری لەسـەر دەكـەن كـە سـەرجەم میدیاكان بەكاربهێنن بۆ دژایەتیی بەناو ڕۆچوون، بەڵام دژایەتییەكان ڕووبـەڕووی ئیسلام و موسڵمانان و ڕەوتی ئیسلامییە بە گشتیی نەك چارەسەری دیاردەكە، بۆ ئەم مەبەستە كۆڕو سیمینارو گفتوگۆی كراوەو كۆنفرانس و... هتد. بۆ هەموو ئەو كەس و لایەنانە ساز دەكـەن كـە بـاس لـەم دیاردەیـە دەكـەن، بـەڵام كەسـانی ئیسلامیی بانگهێشت ناكرێن بۆ ئەو كۆڕو كۆبوونەوانە، لـە وڵاتـە ئیـسلامییەكاندا میدیاكان بە گشتیی و لـە نێوانیانـدا تەلـەفزیۆن بـە ڕەهـایی خراوەتـە گـەڕ بـۆ دژایـەتیی دیـاردەی تـیرۆر، بـەڵام هـەوڵ نادرێـت كۆمەڵـە پـسپۆڕێكی ئیـسلامیی بانگهێشت بكرێن و بەشداریی كۆڕو سیمینارو چاوپێكەوتنەكان بكەن، تا ئەوانیش شان بە شانی دەسەڵات ولایەنەكانی تر ئەم كێشەیە چارەسـەر بكـەن. ئەمـەش وەك ئـەوە وایـە كـارێكی ئـەهلی تایبەتمەند بدەیتـە دەسـت خـەڵكێكی تـر كـە پەیوەندیی بە باسەكەوە نییە.

عەلمانییـەكان زۆریـان ئـەوە ڕەت دەكەنـەوە گفتوگـۆی ئـایینیی بكرێـت لەگـەڵ ڕۆچـووەكاندا و چاكسازیی بكرێـت، چـونكە ئەنجامەكـەی بـە قـازانجی ڕەوتـی ئیسلامیی تەواو دەبێت، ئەمانیش هەر لە سەرەتاوە دژی ئیسلامن وەك پـەیام و بەرنامەو شەریعەت. چونكە زۆرێك لەوانە گفتوگۆی ئایینیی قبـووڵ ناكـەن و بـە دیاردەیەكی ترسناكی دەزانن، چـونكە بـەلای ئەوانـەوە توندڕەویی دەیباتـەوە، چونكە توندڕەوی بەلایانەوە ئیسلامە. عەلمانییـەكان ئـەوە دەڵـێن دوا ئامـانجی

ئیسلامییەكان هەریەكە توندڕەوبن یان میانڕەو. هەردوولا دەوڵەتی دینییان دەوێت.

هاندانی ڕێكخراوی سیاسی و كۆمەڵایەتی و سەندیكایی بۆ دژایەتی توند ڕەوی ئیسلامی، بانگەواز كردن بۆ توندو تیژی لە مامەڵە كردن لەگەڵ ڕۆچووەكاندا، دەوڵەت دەبێت بە توندی دژایەتی بكات و بوار نەدات بە كاری ئیسلامی و كردنەوەی مزگەوت و هەتا دوایی.

ڕەخنە لە پێشنیازی عەلمانییەكان لەمەڕ دژایەتیكردنی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی چەندین تێبینی دروست دەبێت سەبارەت بە پێشنیازیی عەلمانییەكان لەمەڕ قسەكردنیان لەسەر ئایین لەوانە:

**١- تێنەگەیشتنە لە سروشتی ئەم ئایینە:**

ئیسلام ئایینێكی گشتگیرەو هەموو بوارەكانی ژیانی ئادەمیزاد ڕێكدەخات. گوێڕایەڵی و ملكەچیی و تەسلیم بوون بە فەرمانەكانی، لە بنەماو پێداویستییەكانی ئیسلامە، ئەمانەش لە داخوازییەكانی شایەتومانە كە دەڵێین: (أشهد أن لا إله الا الله وأن محمدا رسول الله) خوای گەورەش لە قورئاندا فەرمویەتی: (وما كان لمؤمن و لا مؤمنة إذا قضى الله و رسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ومن يعص الله و رسوله فقد ضل ضلالا مبينا) الاحزاب ٣٦.

بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێكی ئیماندار دروست نییە، كاتێك خواو پێغەمبەرەكەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەر پشك بن لە ئەنجامدانی ئەو كارەدا، چونكە ئەوەی سەرپێچیی بكات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەی، ئەوە بە ڕاستیی و بە ئاشكرا گومڕاو سەرلێشێواوە.

بەڵام عەلمانییەكان مەسەلەكان ئاوەژوو دەكەنەوە چەقی توندڕەویی و توندوتیژیی لەوەدا دەبیننەوە كە داوای جێبەجێ كردنی شەریعەتی ئیسلام

بكرێـت، داواكردنـی ئەمـە بەلایانـەوە رۆچـوون و زێـدەڕۆیی و توندوتیـژیی و توندڕەوییە. ئەوانەی بانگەشە دەكەن بۆ جێبەجێ كردنی شـەریعەتی ئیسلام و بانگەوازەكەیان ئەم بنەمایە دەیگرێتەوە. كە دەڵێت – معلوم من الدین بالضرورة – بانگەوازەكەیان لە كرۆكی ئاییندایە، نەك رۆچوون و زێدەڕۆییە لە ئایندا.

بۆیـە دەبیـنین پێشنیازی عەلمانییـەكان بـۆ چارەسـەری رۆچـوون و زێـدەڕۆیی بریتییە لە لێدانی ئەو كۆڵەكانەی كە توندڕەوەكان كاری لەسەر دەكەن كە بریتییە لە ڕێساو بنەمای – صلاحیة الاسلام لكل زمان و مكان – گونجان و شایستەیی ئایینی ئیسلام بۆ هـەموو كـات و شـوێنێك، جـا ئـەم بنەمایە بنـەماو پێشنیازی تونـدڕەوەكان نییـە، بـەڵكو بنەمایـەكی ئیـسلامیی ڕەسـەنەو بۆیـە پێـشنیازی عەلمانییـەكان لـەم ڕووەوە بانگەوازێكـە بـۆ ڕووخـانی ئـایین و كۆتاییهێنـان بـە بنەمایەكی سەرەكی ئایینی ئیسلام.

بەڵام گـەر بانگەشـەكەیان لێدانی كۆڵەكـەی ئـایین نەبوایـە، بـەڵكو لێدانی ئـەو كۆڵەكانە بوایە كە رۆچوون و زێدەڕۆكان لەسەری دەڕۆن و كاری پێدەكەن وەك بە كافردانـانی كۆمـەڵگای ئیـسلامیی ئـەوا كـارێكی دروسـت و چـاك بـوو، بـەڵام عەلمانییەكان ئاوڕ لەم مەسەلانە نادەنەوە، رۆچوون دەكەنە پاسـاوو بیـانو بـۆ دژایەتی كردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بنەما ڕەسەنەكانی.

**٢ – دژایەتی كردنی دروشم و سرووتە ئیسلامییەكان:**

لە زۆرێك لە نووسین و بەرهەم و بڵاوكراوەكانی لایەنە عەلمانییەكان و گوتارو چاو پێكەوتنەكانیانـدا دژایـەتی كردنـی دروشـم و سـرووتە ئایینییـەكان و دەقـە شەرعییەكانی بواری سزادان بە زەقی دیارە، بۆیە دەبینین ڕەوتی عەلمانیی خۆی خستۆتە نێو بازنەی دژایەتیكردنی ئایین، نەك دژایەتیكردنی دیـاردەی رۆچـوون،

بەڵام ئەمەش وای کردووە بازنـەی کیشەکەی فـراوان کـردووە و دەرەنجامیـشی نابێت.

**٣ – نەبوونی – مرجعیەت – یا سەرچاوەیەك بۆ گەڕانەوەسەری تا چارەسەری ڕۆچوونی پێبکرێت:**

لە نووسین و بڵاوکراوەکانی عەلمانییەکاندا پێوەرێکی دروست بەدی ناکرێت بـۆ چارەسەرکردنی ڕۆچوون و ڕۆچووەکان، بەڵکو هەمان پێوەری ڕۆژئاوایی دووبارە دەکەنەوە، زۆر جار دووبارەکردنەوەکەش بـە شـێوەیەکی سـەقەت و لاسـەنگە، پێوەری ڕاست و دروست ئەوەیە ڕۆچوون لـە ئاییـندا، لادانـە لـە ڕەوتـی خـودی ئایینەکە، ڕۆچوونەکەش دراوەتە پاڵ ئایین گریمانی تەواو ئەوەیە ڕۆچووەکان بە پێی ئاییینەکەیان دادگایی بکرێن، ئەو کـارو رەفتارانـە کـە بـە ڕۆچـوون دەدرێتـە قەڵەم دەبێت بە پێی دەقەکانی ئایین ئەو کارو ڕەفتارانە ڕۆچوون و لادان بێت لە ئایین، نەك بە پێی حەزو ویست و هەر دیدو ئایدیۆلۆژیایـەکی تـر. عەلمانییـەکان زۆرجار ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ ڕۆچـووەکان، بـە پێـی پێـوەری ئـاییینیی ڕەت دەکەنەوە، چونکە هەست دەکەن زۆرجار بە بەرژەوەندیی ئەوان کۆتایی نایەت، بەڵکو لـە بەرژەوەنـدیی میللەتدایـە، دەسـەڵات خـۆی هـەوڵ بـدات مەرجەعیـەت دروست بێت بۆ ئیسلامییەکان تا خەڵکیی لەم لاولاوە نەبێتە موفتیی و کێشە بۆ وڵات و میللەت دروست نەبێت.

**٤ – گەورەکردنی دیاردەی ڕۆچوون و زێدەڕۆیی ترس و تۆقاندن:**

پێشنیازی عەلمانییـەکان بـەوە دەناسـرێتەوە، کـە فـوو بـە دیـاردەی ڕۆچـووندا دەکەن و لـە قـەبارەی خـۆی زۆر گـەورەترو ترسـناك تـر پیـشانی دەدەن، ئـەم گەورەکردنەش لقێکە لە چـەمکی ڕۆچـوون بـەلای عەلمانییەکانـەوە، وا نیـشانی

خەڵکی دەدەن، رۆچوون لە جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامدایەو مەترسییەکی گەورەیە گەر ئیسلامییەکان دەسەڵات بگرنە دەست و حوکمڕانی وڵات بکەن.

٥– گاڵتەو لاقرتی پێکردن:

زۆرجار عەلمانییەکان پێوەری بابەتی و زانستییانە لە دەست دەدەن و پەنا دەبەنە بەر گاڵتەجاڕیی و سووکایەتیی بە ئیسلامییەکان و جل و بەرگ و سیمایان، یان بە کارهێنانی ناوو ناتۆرەی نەشیاوو دور لە ئایین و ڕەوشتی پەسەند، یان لە میدیاکاندا لە ڕێگای فلیم و شانۆگەریی و نواندنەکاندا سووکایەتیی و گاڵتەجاڕییو بە ڕەوت و سیما ئیسلامییەکان دەکرێت، ئەم جۆرە ڕەفتارانە ناچنە خانەی چارەسەری دیاردەی رۆچوون، بەڵکو کێشەکان قووڵتر دەکات و زۆرجار دەبێتە پاساو بۆ ڕۆچووەکان تا لەسەر رۆچوونەکانیان بەردەولم بن.

٦– نەشارەزایی لە دین:

یەکێك لە دیاردەکانی چارەسەرە عەلمانییەکان بۆ کێشەی رۆچوون، نەشارەزابونیانە بە ئایین و دەقەکانی قورئان و فەرمودە. ئەم کێشانەش چارەسەری تەواوی لە نێو بازنەی ئاییندایە، ئەمانیش لەو بوارەدا شارەزا نین. بۆ نموونە: ڕۆچووەکان ڕاڤەی ئایەتێك یان فەرمودەیەك دەکەن بە شێوەیەك لێی دەکەن و کاری پێ دەکەن، پێچەوانەیە بە دەقەکانی شەریعەت، بەڵام عەلمانییەکان بۆچوونی دروست و ڕاڤەی تەواوی بەڵگە شەرعییەکان نازانن تا حوکمی شەرعیی لەو بارەیەوە بخەنە ڕوو، ماوەتەوە پێیان بوترێت چاکی مەکەن با خراپ نەبێت.

٧ – دژایەتیکردن:

پێشنیازی عەلمانییەکان لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەموو تواناکانی نێو کۆمەڵگە بخرێتە گەڕ بۆ دژایەتیکردنی توندڕەویی، بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکەن بە توندوتیژیی مامەڵە لەگەڵ توندڕەوی و زێدەڕۆییدا بکرێت و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و حیزب و ڕێکخراوەکانیان و سەندیکاکان ڕۆڵی خۆیان هەبێت لە دژایەتیی ئەم دیاردە ترسناکەدا.[٥٩]

وەك پێشنیازو بنەما ئەمانە کاری باشن گەر بۆ چارەسەری دیاردەی ڕۆچوون و ڕۆچووەکان بێت و بەس، نەك ئەمانە بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام و ڕەوتی ئیسلامیی بێت بە بێ جیاوازیی.

ئەمەو ڕوبەڕووبوونەوەی دیاردەی ڕۆچوون پێویستی بە چەندین بنەمای زانستیی و شەرعیی هەیە، ناکرێت کوێرانەو بە کاردانەوەی هەڵە پەنا بۆ چارەسەری کێشەیەکی وا ببرێت. پێویستە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەستیان والاکرێت بۆ ڕیشەکێش کردنی دیاردەی ڕۆچوون و لادان، بەڵام بە پێی پێوەرێکی شەرعیی و زانستیی، مەبەستیش چارەسەرکردن بێت نەك دژایەتیی ئایین و کولتووری ئایینی ڕەسەن.

## باسی پێنجەم: چەند ئامۆژگاریی و بەرچاوڕوونییەك بۆ چارەسەرکردنی ڕۆچوون.

ڕۆچوون کێشەو نەخۆشییەکە و چارەسەرکردنەکەشی دڵسۆزی و نیەتپاکیی و شارەزایی دەوێت. ڕۆچوون هەڵەو لادانە، بە کاردانەوەو هەڵەی بەرامبەر چارەسەر ناکرێت، ڕۆچوون دەرچوونە لە هێڵی میانڕەوی ئیسلام، چارەسەریش گەڕانەوەیە بۆ سەر ڕەوتی میانەیی ئیسلام، هەر نەخۆشییەك گەر بمانەوێت چارەسەری

[٥٩] بڕوانە مشكلة الغلو في الدين، لا ١١٧٠–١١٧٥

تەواوی بۆ بکەین دەبێت رێوشوێنی چارەسەری گونجاو بگرینە بەر، رۆچوونیش نەخۆشییەکە دەبێت وەك نەخۆشییەك مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و چارەسەری نەخۆشەکە بکەین و نەهێڵین نەخۆشییەکە بڵاوبێتەوەو تەشەنە بکات و کەسانی تریش بگرێتەوە، جا دەبێت چارەسەرکەر دڵسۆزو شارەزابێت و خاوەن پێوەری راست و دروست بێت و مەبەستیشی رەزامەندیی پەروەردگارو سەرکەوتن و بەختەوەریی گەل و وڵاتەکەی بێت. بێگومان دیاردەی رۆچوون وەك لە باسەکەماندا بە کورتی ئاماژەمان پێ کردووە کە دیاردەیەکی دەتوانین بڵێین مرۆڤایەتیی و لە نێو هەموو گەل و وڵات و ئایین و رێبازێکدا بە درێژایی مێژوو بە رێژەی جیاجیا حوزوری هەبووە، عێراق و هەرێمی کوردستانی خۆمانیش بە دەرنین لەم دیاردەیە و ئێمەش باجی ئەم دیاردەو لادانەو بەهەڵە چارەسەر کردنەکانیشیمان داوە، بۆیە لە کۆتایی باسەکەماندا بەچاکی دەزانم وەك بەرپرسیاریەتییەکی سەرشانم بەرامبەر بە ئایین و گەل و وڵاتەکەم چەند ئامۆژگاریی و کار راییەك و خاڵێك بخەمە روو بە مەبەستی چارەسەرکردن و سنووردانان بۆ کێشەی رۆچوون و نەهێڵانی بەڵگەو پاساو بەدەست کەسانێکەوە کە هانا بۆ رۆچوون دەبەن و لە هێڵی میانرەوی ئیسلام لا دەدەن.

١– چاوخشاندنەوە بە بەرنامەکانی پەروەردەو فێربوون بە گشتیی و بایەخدان بە وانەی پەروەردەی ئیسلامیی و قورئان و فەرموودە و مامۆستایانی شارەزاو پسپۆری بوارەکە وانەکان بڵێنەوەو تا نەوەکانمان پەروەردەیەکی ئیسلامیی راست و دروستیان هەبێت، بوار نەدرێت وانەی ئایینیی پەراوێز بخرێت و بە لاوەکی بژمێردرێت و کەسانی نەشارەزاو بێئەزموون بیانلێنەوە، وەك لە رابردوودا کراوە.

٢– کەناڵەکانی راگەیاندن رۆڵی دڵسۆزانەو پۆزەتیڤانە ببینن و رێزو حورمەتی ئایینی کۆمەڵگا راگرن و لە سەنگەری دژایەتیکردنی ئاییندا نەبن و میدیاکان

نەكرێتـە مینبـەرێك بـۆ دژایـەتیی عەقیـدەو بیروبـاوەڕو داب و نـەریتی ڕەسـەنی جەماوەر.

٣- پاراستنی داب و نەریتە گشتییەكانی نێو كۆمەڵگاو پاراستنی ڕەوشت و بەها ئیسلامییەكان.

٤- بایەخدان بەزانایانی ئیـسلامیی و بـانگخوازان و ڕەوتـی ئیـسلامیی میـانڕەوو هاوكاریكردنیان لە هەموو بوارێكەوە، چونكە ئەمان لە هەموو كـەس و لایـەن و كەناڵێك زیاتر دەتوانن ڕۆڵی چاك ببینن لەم بوارەداو كلیلی چارەسەرەكانن.

٥- چاو خشاندنەوە بە یاساكانی وڵاتدا، ئەو یاساو ڕێنمیایانەی زوڵم و سـتەمی كۆمەڵایەتییان تیا بەدی دەكرێت هەموار بكرێت.

٦- كە دەڵێین ئیسلام ئایینی كۆمەڵگاو دەوڵەتەو ئیسلام سەرچـاوەی یاسـایەو دەقەیاساییەكانی تـریش نابێـت پێـچەوانەی ئیـسلام بـن، ئەمانـە ناكرێـت تـەنها دروشمی چاوبەستەكیكردن بێت لـە جـەماوەرو كـاری لەسـەر نـەكرێت، لیژنـەی یاسـایی پـسپۆڕ دابنرێـت و پـڕۆژەی یاسـایی گەلاڵـە بكـەن و ئـەو یاسایانەشـی پێچەوانەیە بە ئیسلام هەموار بكرێـت و بخرێتـە بـەردەم ئەنجومـەنی نیـشتیمانی عێراق و پەرلەمانی كوردستان بۆ بڕیار لەسەر دانی بە پێی تایبەتمەندی.

٧- چارەسەری كێشە ئابووریـیـەكان و چارەسـەری كێـشەی لاوان وەك كێـشەی كارو هاوسەرگیریی و كێشەی نیشتەجێ بوون.

٨- چاك سازیی سیاسیی و فەراهەمهێنانی ماف و ئازادییەكان.

٩- بایەخدان بەیەكەی خێزان و هاوكارییكردنی دایكان تا ڕۆڵەكانیان بە چاكیی و دروستیی پەروەردە بكەن.

١٠- نابێت لە چارەسەركردنی كێشەی ڕۆچووندا دیالۆگ و گفتوگۆی مەبەستدارو بابەتیانە فەرامۆش بكەین.

١١ – هۆكارەكانی توندیی و ڕۆچوون و لادان بە شێوەیەكی زانستیانەو بابەتییانە لەلایەن كەسانی پسپۆڕەوە تاوتویێ بكرێت و كەسانی زاناو شارەزا بە بوارەكە قسەو باسی لەسەر بكەن و چارەسەری بۆ دەست نیشان بكەن، نەك خەڵكانێك بە سروشت و ئایدۆلۆژیای خۆیان بڕوایان بە ئیسلام نییەو دژایەتی ئاینیش بە كاروچالاكیی خۆیان دەزانن، هان بدرێن و بواریان بۆ بڕەخسێت تا دیاردەی توندڕەویی و ڕۆچوون بقۆزنەوە بۆ مەرام و مەبەستەكانی خۆیان و میدیاكانیان بۆ بكرێتە مینبەرێك بۆ دژایەتیی ئیسلام و موسڵمانان و سەپاندنی یاساو بەرنامەو ڕۆشنبیریی دژە ئایینیی بەسەر كۆمەڵگاداو چاوبەستەكی لە خەڵكی بكەن و ڕاستییەكان ئاوەژوو بكەنەوە.

١٢ – كارو دامەزراندن لە پۆستە ئیدارییەكانی وڵاتدا مافی هەموو هاووڵاتییەك بێت بە بێ جیاوازیی لایەنی سیاسیی و دیدو بۆچوون، تاكە پێوەر بۆ دامەزراندن، هاووڵاتیبوون و پسپۆڕیی و شارەزایی و بڕوانامەی زانستیی بێت نەك حزبایەتیی و خزمایەتیی و شتی تر.

١٣ – بایەخدان بە قوتابخانەی زانستە شەرعییەكان و كۆلیج و پەیمانگا ئیسلامییەكان و بەهێزكردنیان لە هەموو ڕوویەكەوەو دامەزراندنیان دوای تەواوبونی قۆناغەكانی خوێندنیان بە تایبەت لە مزگەوتەكاندا.

١٤ – ئازادیی بیروڕا نەكرێتە پاساوێك بۆ دژایەتیی ئایین و خووڕەوشت و دەقە پیرۆزەكان، ئیهانەی بیروباوەڕی جەماوەر نەكرێت لە ژێر ئەم جۆرە پاساوانەدا.

١٥ – وەزارەتی ئەوقاف ڕۆڵی پۆزەتیڤانە ببینێت لە پەروەردەكردن و هۆشیاركردنەوەی خەڵكیی لە ڕێگای مینبەری مزگەوتەكانەوە، دانانی وتاربێژ و مامۆستای بەهرەمەند بۆ ئەم بوارە هەستیارە و وەلانانی پێوەری تەسكی حیزبایەتیی.

لە کۆتاییدا دەڵێم ئەمانەی خرانە ڕوو چەند ئامۆژگاریی و بەرچاوڕوونییەك بوو تا دڵسۆزانە کاری لەسەر بکرێت، بە هیوای ئەوەی بتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ چارەسەرکردنی هەر دیاردەیەکی ڕۆچوون گەر هەبوو یان سەری هەڵدا. بێ ئەم ڕاستییانەی ئاماژەمان پێدا هەر هەوڵێکی پێچەوانە بەمانە کە زادەی بیرو بۆچونی نامۆن بە ئایین و کولتوورو داب و نەریتی کۆمەڵگا نەك هەر کێشەی ڕۆچوونی پێ چارەسەرناکرێت، بەڵکو کێشەو تەنگەژەکان قووڵتر دەکاتەوە، مێژووی کۆن و نوێ باشترین شاهید حاڵە.

سبحانك اللهم و بحمدك و أشهد أن لا إله الا أنت أستغفرك وأتوب إليك

سەرچاوەكان:

١- تەفسیری ئاسان/ دانانی مامۆستا برهان محمد ئەمین.

٢- صحيح البخاري للامام ابي عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري المتوفي ٢٥٦ ه- و معه من هدي الساري شرح غريب صحيح البخارى الامام ابن حجر العسقلاني المتوفي ٨٥٢ ه- / تحقيق خليل مامون شيحا / دار المعرفة بيروت - لبنان الطبعة الثانية ١٤٢٨ ه- ٢٠٠٧ م.

٣- صحيح مسلم للامام الحافظ مسلم بن الحجاج النيسابوري المتوفي ٢٦١ ه- حقق اصوله و خرج احاديثه على الكتب الستة و رقمه: الشيخ خليل مامون شيحا / دار المعرفة بيروت - لبنان الطبعة الثانية ١٤٢٨ ه- ٢٠٠٧ م.

٤- سنن الترمذي /تخريج و ترقيم و ضبط صدقي جميل العطار دار الفكر للطباغة والنشر و التوزيع - بيروت - لبنان / ٢٠٠٥م.

٥- سنن النسائي/ المسمى بالمجتبى وبهامشه حاشيه الامام السندي المتوفي ١٠٣٨ه- تخريج و ترقيم و ضبط صدقي جميل العطار/ دار الفكر للطباغة والنشر و التوزيع - بيروت - لبنان / ٢٠٠٥ م.

٦- الغلو في الدين في حياة المسلمين المعاصرة تاليف عبدالرحمن بن معلى اللويحق، مؤسسة الرسالة ١٤٢٣ه- / ٢٠٠٢م.

٧- مشكلة الغلو في الدين في العصر الحاضر، الأسباب- الآثار- العلاج: تاليف عبدالرحمن بن معلى اللويحق، الطبعة الاولى ١٤١٩ه- / ١٩٩٨ م.

٨- الاعتصام للامام ابي اسحاق ابراهيم الغرناطي الشاطبي/ تحقيق الشيخ عبدالرزاق المهدي/ دار الكتاب العربي بيروت لبنان ١٤٢٦ ه / ٢٠٠٥ م.

٩- فتح المعين في التعليق على اقتضاء الصراط المستقيم/ تاليف: شيخ الاسلام احمد بن عبدالسلام بن تيمية ٦٦١- ٨٢٨ه-/ تعليق فضيلة الشيخ محمد بن

صالح العثيمين رحمه الله/ خرج احاديثه محمود بن الجميل دار ابن الجوزي القـاهره الطبعة الاولى ١٤٢٣ ه / ٢٠٠٢ م.

١٠- پوختەی صحيحی مسلم/

١١- الغلو في التكفير- المظاهر- الأسـباب- العـلاج/ ابـو حـسام الـدين الطرفـاوي (الكتاب مأخوذ من الانترنت).

١٢- التطرف والغلو- الأسباب- المظاهر- العلاج/ اعداد: د. طارق محمد الطـواري (مأخوذ من الانترنت).

١٣- أسباب الإرهاب والعنف والتطرف- دراسة تحليلية/ د. أسمـاء بنـت عبـدالعزيز الحسين (مأخوذ من الانترنت).

١٤- جـذور الغلـو/ تـأليف: عبـدالرجمن بـن محمـد بـن علـي الهـرفي (مـأخوذ مـن الأنترنت).

١٥- الجذور التاريخية لحقيقة الغلو و التطرف و الارهاب و العنف/ اعداد د علـي بـن عبدالعزيز بن علي الشبل.

١٦- حرمة الغلو في الدين وتكفير المسلمين/ تأليف وإعداد: أسـامة ابـراهيم حـافظ، عاصم عبدالماجد محمد/ الطبعة الأولى ٢٠٠٤.

| ژ | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەكەم) | جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵلا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان (كتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |

| | | |
|---|---|---|
| | روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان<br>رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی رەشید<br>دكتۆر صەباح بەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانـە، نـەك رەنگدانـەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێكهاتنی، رێكخستنی، چەكەكانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتـۆر موحـسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە<br>پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەكـەمین دەسـتووری نووسـراو لـە جیهانـدا، بـەڵـگەنامەیەكی گـرنگی سـەردەمـی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیـسلامناسیی یـان ئیـسلامنەناسیی، وەڵامێـك بـۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیكرام كەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشكردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆكێكی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووكی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>كۆمەڵە دیدارێكە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناكبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاكەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەكانی بوخاری و موسلیم | ئامادەكردن و وەرگێڕانی: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەكخستنی میرنشینە كوردییەكاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد كاكە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەكان، ڕەواندنەوەی كۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەكانی ئیسلام | ن: دكتۆر كەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٨ | عوسمـــــانی کـــوڕی عـــەففان، کەســـایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیــەك دەربــارەی  راگەیانــدن و راگەیانــدنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییـەکان دەبنـە گـرنگ، دیمانـەی مامۆسـتای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمیـــد ئەحمـــەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووســینی: مــەلا موحەممــەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قــانع خورشــید پێــشەکی بــۆ نووســیوەو رێکیخــستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کـۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانـــی: کـــاوە محەمـــەد شارباژێری |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفى محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی كوردەكانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |
| ٥١ | ئایا خوا كچی هەیە ؟<br>وەڵامێك بۆ كتێبی (كچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری ئوسوولّیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | ئاین لەفكری مسعود موحەممەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غەفور |
| ٥٥ | دەروازەیەك لەمەڕ كێشەی ڕۆچوون لە ئاییندا | یاسین ئەحمەد زەنگەنە |